ئاستانه



# خوێندنەوەیەکی ڕەخنەیی بۆ سەفسەتە و هەڵە هزرییەکان

نووسینی: د. ئامـــاد کازم
وەرگێڕان: ڕێکخراوی ئاستانه





## دکتۆر ئاماد کازم

پرۆفیسۆری یاریدەرەر، د. ئاماد کازم

هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرایە لە زانکۆی ملایا لە مالیزیا

هەڵگری بڕوانامەی ماستەرە لە زانکۆی مووسڵ

لە ساڵی ٢٠١٤ وەک ڕاوێژکاری هزری هەڵبژێردرا، لە کۆڕبەندی جیهانی (صناعة المفکر)، لە وڵاتی مالیزیا.

لە ساڵی ٢٠١٤ وەک وانەبێژ لە بواری هزری و زمانی کاری کردووە لەژێر پڕۆگرامی (صناعة المفکر) لە مالیزیا.

هەر لە ساڵی ٢٠١٥وە تا ئێستا مامۆستای فەلسەفە و لۆژیک و خوێندنی باڵایە لە زانکۆی زاخۆ.

لە ساڵی ٢٠٢٠ وانەبێژی ئۆنلاین بووە لە زانکۆی (Al-Madinah International University) لە مالیزیا.

بەشداریی لە پازدە کۆنفرانسی جیهانیی کردووە لە وڵاتانی: میسر، مالیزیا، تورکیا، مەغرب و عێراق.

نزیکەی ٢٠ لێکۆڵینەوەی زانستی و ئەکادیمیی لە گۆڤارە جیهانییە باوەڕپێکراوەکاندابڵاوکردوونەتەوە.

**چەندین پەڕتووکی بە زمانی عەرەبی و کوردی نووسیون:**

(المـحاجة العقلية في برهنة حقائق القرآن الكريم) جاری یەکەم لە وڵاتی میسر چاپ و بڵاوکرایەوە. بۆ جاری دووەم لە دەزگای «نوور پابلش» بڵاوکرایەوە. جاری سێیەمیش لە (مؤسسه السبیل) بڵاوکرایەوە.

(جدلية اعجاز النص القرآني لغوياً وفكرياً- اعتراضات ومعالجات). جارێک لە وڵاتی لوبنان چاپکراوە و بۆ جاری دووەمیش لە بەغدا چاپکراوە.

(ظاهرة التأثير والتأثر بين التوجيه النحوي والمعنى في ضوء نظرية النظم)، لە وڵاتی میسر چاپکراوە.

(النزعة الشكوكية بين جذورها التاريخية ونتاجها المعاصر) تحت الطبع.

«ئیلحاد - شرۆڤەکرنەکا ئاقلانە و زانستییە ب شێوازێ دان و ستاندنێ» لە ئێران چاپکراوە.

«هەلوەشاندنا گۆمانبازییان ل دۆر قورئان و سوننەتێ»

«تێگەهێ فەلسەفێ - گەشتەکا هزری بۆ بنەما و تیور و سیستەمێن فەلسەفی»

«تیـــورا مـــەعـــریفێ (ئیبستمۆلۆژیا) - گەشتەکا هزری بۆ بنەما و تیور و سیستەمێن مەعریفێ»

«تیـــورا هەبوونا (ئەنتولۆژیا) - گەشتەکا هزری بۆ بنەما و تیور و سیستەمێن هەبوونێ» ل ژێر ئامادەکرنێدایە.

«خوێندنەوەیەکی ڕەخنەیی بۆ سەفسەتە و هەڵە هزرییەکان» ئەم پەڕتووکە وەرگێڕدراوەی بەردەستتانە.

هەروەها پێشەکیی بۆ ١٣ پەڕتووک نووسیون.

# خوێندنەوەیەکی ڕەخنەیی بۆ سەفسەتە و هەڵە هزرییەکان

نووسینی:

**دکتــۆر ئامـــــاد کازم**

وەرگێڕان لە بادینییەوە:

**ڕێکخـــــراوی ئاســـتانە**



# پێشەکی

ئەم پەڕتووکە خوێندنەوەیەکی مەعریفی و لۆژیکییە بۆ نیشاندانی فیکرەی سۆفێستائی، هەروەها باسکردنی ڕیشە مێژووییەکانی و هۆکارەکانی پەیدابوونی و ڕێگاکانی بڵاوبوونەوەی. ڕوونکردنەوەیەکە کە چۆن سۆفێستائییەکان توانییان خەڵک بخەڵەتێنن و مێشکیان لەکاربخەن و بیکەن بە کۆیلە بۆ بەدەستهێنانی بەرژەوەندییە تایبەتەکانیان. هەروەها باس لەوە دەکات کە چۆن سۆفێستائییەت لە سەردەمی ئێمەدا بە ڕێگەی ڕێبازی «نوێخوازی» (حداثة) و «دوای نوێخوازی» (ما بعد حداثة) ساخکراوە و کاریگەریی لەسەر ژیانی ئێستامان چییە؟ چۆن سەفسەتە (بەهەڵەدابردن) بە مەرەمی خەڵەتاندنیان بڵاودەکرێتەوە بۆ جێبەجێکردنی هەندێک ئامانجی ئایدیۆلۆژیی تایبەت. ئەم پەڕتووکە ڕەخنەیەکی لۆژیکییە بۆ بنەماکانی سەفسەتە و هەڵە هزری و دەرەنجامە مەعریفییەکانی.

پەرتووکەکە باسی ئەو مەحاڵە عەقڵییانەش دەکات کە هزری ماددیگەری بۆ سەلماندنی ماددیگەرایی خۆیان بەکاری دێنن، لەوانەش: «مەحاڵی ڕێزبەندیی بێسەرەتا، مەحاڵی بازنەیی، مەحاڵی زاڵکردن بەبێ زاڵکەر» ئەم مەحاڵانە هەمووی باس کراون و بە شێوەیەکی فەلسەفی و لۆژیکی هەڵوەشێندراونەتەوە.

دواتر باسی ئەو گریمانە ماددییانەمان کردوون کە بە سروشتەوە گرێدراون. چوار گریمانەی ماددیمان خستوونەتە ڕوو: گریمانەی یەکەم: «دروستبوونی گەردوون بەبێ هۆکار»، گریمانەی دووەم: «ڕووداوە ماددییەکان ژیانیان هێناوەتە بوون.»، گریمانەی سێیەم: «ژیان لەخۆیەوە پەیدابووە.»، گریمانەی

چوارەم: «ژیان خواستی سروشت بووە.» پاشان بە ڕێگای هاودژی لەگەڵ خودی خۆیاندا شکستی ئەم گریمانانەمان خستوونەتە ڕوو، بەهۆی ئەوەی لەسەر هەندێک مەحاڵی عەقڵی بنیاتنراون کە مەحاڵە ئەو شتانە ڕووبدەن.

دواتر باسی هەندێک هەڵەی هزری کۆن و هاوچەرخمان کردوون و سەرنجمان خستووەتە سەر ئەو هەڵەیانەی لەلایەن ڕاگەیاندنەکانەوە بڵاوکرانەتەوە، تا خەڵکی پێ بخەڵەتێنن لەپێناو هەندێک ئامانجی تایبەت بە کۆمەڵە ئایدیۆلۆژیایەکی دیاریکراو.

لە کۆتاییدا، هیوادارم توانیبێتمان لەم پەڕتووکەدا گەنجەکان هۆشیاربکەینەوە تا بە بیری سەفسەتەی سەردەم نەخەڵەتێنرێن و ڕێیان لێ ون نەبێت، تاوەکوو کاریگەر نەبن بە گریمانە مادیگەراییەکان -ئەوانەی کاردەکەن بۆ ڕەتکردنەوەی باوەڕ-، هەروەها بەهۆی هەڵە هزرییەکانی ڕاگەیاندن و ئەو هەڵە لۆژیکی و هزرییانە نەخەڵەتێن کە هەندێک کەسی ڕۆشنبیر و وتاربێژەکانی دەسەڵات پێی هەڵدەستن لەپێناو بەدەستهێنانی بەرژەوەندییە ئایدیۆلۆژییەکانیان.

د. ئامـــــاد کازم

# بەشی یەکەم

## بیرۆکەی شەک و مێژووەکەی

بەپێی لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونی مێژوونووسان لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، پێش شارستانیەتی یۆنانی، کێشەی شەک[1] نەگەیشتبووە ئەو ئاستەی ببێتە دیاردە و نەببوو بە ڕێبازێکی هزری، بەڵکوو تەنیا بە شێوەیەکی ڕێژەیی بوو. واتە شەک دەربارەی کێشەی بوون و مەعریفە نەبوو، بەڵکوو گرنگی بەوە دەدرا کە بوون و ئەو شتانە چین کە پێیەوە گرێدراو بوون، وەک: مردن و ژیانێکی تر، چونکە شارستانییەتەکانی پێش شارستانییەتی یۆنان لە باوەڕەوە نزیک بوون.[2]

سەرەڕای ئەوەی ئەوکات هیچ گرنگیدانێک بە نووسین نەبوو، بەڵام بەپێچەوانەوە، شارستانییەتی یۆنانی چەندین نووسینی خۆی لەبارەی ئەو شتانەی لە سەردەمی ئەواندا ڕوویاندابوو، گواستووەتەوە بۆ ئێمە، وەک گرنگیدان بە بابەتە مەعریفییەکان و کێشەکانی و ئەوانەی پەیوەندییەکی گەورەی بە شەکەوە هەیە.

ئاشکرایە، یەکەم ڕێبازی فەلسەفی کە بە ئێمە گەیشتووە، فەلسەفەی یۆنانییە. ڕاستە ڕێبازە فەلسەفییەکانی: چین، هیند، میسر و عێراق هەبوون،

---

(١) (اليقين= ١٠٠٪. الظن= ٥١-٩١٪. الشك= ٥٠٪. الوهم ١-٤٩٪. الجهل البسيط ٠٪. الجهل المركب= اقل من ٠٪.) ئەمە ڕیزبەندیی ڕێژەی زانینە. لە کوردیدا زۆر جار بە هەڵە وشەی «گومان» بۆ (الشک، والظن) بەکاردێنن، بەڵام هەڵەیە و مانایان جیاوازە. بۆیە وشە عەرەبییەکەم بەکارهێنایەوە. (وەرگێڕ)

(٢) الدين عند الإغريق والرومان والمسيحين: أبكار السقاف: (١٦- ٢٠).

بەڵام تەنیا هەندێک بۆچوونی کەم و پەرشوبڵاو لە هزر و فەلسەفەکانیان بە ئێمە گەیشتوون.[1] بۆیە ئێمە لە باسەکەماندا، لە ڕەگ و ڕیشە مێژوویەکانی شەک لە سەردەمی یۆنانییەکانەوە دەست پێ دەکەین. ئەمەش بەهۆی گرنگییەکەی، بەتایبەت ئەو گرنگییەی کە لەم سەردەمەدا بەدەستی هێناوە و بەهۆی ئەو کاریگەرییەشی کە لەسەر مێژووی کۆن و نوێ هەیەتی.

## شەک لە سەردەمی یۆناندا

ڕوونە مێژووی شەک کۆنە و بەدرێژایی ژیانی مرۆڤەکان هەبووە، بەڵام پێنج سەدە پێش زایین مێژوونووسان دیاردەی شەکیان لەناو شارستانیەتی یۆناندا تۆمار کردووە. ئەم مێژووەش دەبێتە دوو بەش:

بەشی یەکەم: شەک لەپێش سۆفێستائییەکاند

بەشی دووەم: شەک لە سەردەمی سۆفێستائییەکاندا

### ١- شەک لەپێش سۆفێستائییەکاندا

یەکەمین دەرکەوتنی شەک لە شارستانیەتی یۆنانیدا دەربڕین بوو لە هەندێک وتە کە لەلایەن هەندێک فەیلەسووفەوە پارێزرابوون، بەڵام بەگشتی بانگەشەی شەکی ڕەهایان نەکردبوو و کولتوورێکی فەلسەفییان نەبوو کە پشت بە شەک ببەستێت.

لە دیارترین فەیلەسووفە یۆنانییەکانی پێش سۆفێستائییەکان «هیراکلیتس»ە کە لە ٤٧٥ی پێش زایین کۆچی دوایی کردووە. هیراکلیتس شەکی لەو

---

(١) محاضرات في الفلسفة القديمة: فيصل بدير عون: (٢٥٨).

زانینە هەبوو کە بە رێگای هەستەکانەوە دەزانرێت. ئەو دەیوت: ئەو شتانەی ئێمە لەرێگەی هەستەوە دەیانزانین، بەس نین بۆ گەیشتن بە راستی، بەڵکوو مرۆڤ پێویستە بەقووڵی بچێتە ناو ئەوەی لە پشت دیاردەی هەستپێکردنەوە هەیە، لە پەیوەندی و رامانەکەیدا. هەروەها دەڵێت: زۆرجار راستیی شتەکانمان لێ شاراوەیە، چونکە دەرەوەی وەک ناوەوە نییە.

ئەوەش دەڵێت: "هەموو شتێک لە گۆڕانی بەردەوامدایە، تۆ دوو جار ناچیتە ناو هەمان رووبار، چونکە بەردەوام ئاوێکی نوێ لە دەورووبەرتدا دەڕوات." بەپێی ئەمەش، دڵنیایی ئێمە لە شتەکان و وردبینیمان رەت دەکاتەوە، چونکە ئەو دڵنیاییە بەردەوام دەگۆڕدرێت. کاتێکیش دڵنیابووی کە دوو جار چوویتە ناو رووبارەکەوە، ئەوا ئەو دڵنیاییە لەناودەچێت، چونکە دەزانیت کە دوو جار چوویتە ناو دوو رووبار، یان هەر جارێک چوویتەتە ناو رووبارێکی نوێوە.[1]

ئەگەر شتەکان لای ئەو لە گۆڕانێکی پێکەوە گرێدراودا بن، کەواتە هیچ شتێکی نەگۆڕ لای ئەو نییە و هیچ شتێک بە سیفەتێکی جێگیر وەسف ناکرێت. بەپێی ئەمەش، هیچ شتێکی رەها یان نەگۆڕ لای ئەو نییە، بەڵکوو شتەکان رێژەیین، ئەمەش بەو واتایە دێت کە زانینمان رێژەییە.

بۆچوونی لەم شێوەیە لەلای فەیلەسووفانی میسر و عێراق و چینیش بەربڵاو بوون. بەم جۆرە، ئەو بۆچوونە جیاوازانە لە بیری فەیلەسووفە سەرەتاییەکان دەبینران، بەڵام هیچ رێبازێکی شەکگەراییان دانەمەزراندبوو. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم بۆچوونانەیان بنەمایەکی بەهێزیان پێکهێنا کە رێخۆشکەر بوو بۆ سەرهەڵدانی جوولانەوەیەکی شەکگەرایی بەهێز کە کاریگەری گەورەی لەسەر ژیان و گوزەرانی یۆنان و دوای ئەویش دانا، ئەویش پەیدابوونی جوولانەوەی سۆفیستائییە کە لە لاپەڕەکانی داهاتوودا باسی لێوە دەکەین.

---

(١) مدخل إلى الفلسفة بنظرة اجتماعية: ١٧٥، تاريخ الفلسفة اليونانية: ماجد فخري: (٣١).

## ٢- پەیدابوونی شەک لە سەردەمی سۆفێستائییەکاندا

دەرکەوتنی ڕێبازە شەکگەراییەکان لەسەر دەستی کۆمەڵێک سۆفیستائی بوو، لەو کاتەوە ئەمانە بوونە قوتابخانەیەکی هزریی بەهێز و توانییان ببنە یەکەم ڕێبازی شەکگەرایی، لەوێوە «شەکی ڕێبازی – الشک المذهبي» لەسەر دەستی ئەوان دەستی پێ کرد.

## پێناسەی سۆفێستائییەت

سەفسەتە (بەهەڵەدابردن) وشەیەکی یۆنانییە، بنچینە زمانەوانییەکەی «سوفییێست»ە، واتای «مامۆستای دانا - المعلم الحکیم» دەگەیەنێت. پێیان دەوت مامۆستای دانا، چونکە لە بواری بەڵگەی عەقڵیدا زۆر شارەزا بوون و پسپۆرییەکی باشیان لە بواری ڕەوانبێژیدا هەبوو و توانای باشیشیان لە قەناعەتپێکردنی خەڵکیدا هەبوو.[١]

بەڵام دواتر مانای «سۆفییێست» لە «مامۆستای دانا» گۆڕدرا بۆ«مامۆستای فیڵباز» یان «کەسی فێڵباز». ئەم گۆڕینەش لەبەر چەند هۆکارێک بوو کە دواتر باسی لێوە دەکەین.

لە لایەنی فەلسەفییەوە، چەندین پێناسە بۆ «سەفسەتە» دانراون و زۆربەی لێکۆڵەران وا پێناسەی دەکەن: "شێوازێکی بەهەڵەدابردن و فێڵبازییە لە هێنانەوەی بەڵگە و بەکارهێنانی هەڵەی لۆژیکی (مغالطات منطقیة) لە دانوستاندنەکاندا بە مەبەستی بەهەڵەدابردن و خەڵەتاندنی خەڵک.»[٢]

---

(١) معجم اللغة العربية المعاصرة، أحمد مختار عبد الحميد عمر: (١٠٧٣/٢). المعجم الفلسفي: جميل صليبيا: (١/ ٦٥٨).

(٢) كتاب التعريفات، علي بن محمد الشريف الجرجاني، (١١٨- ١١٩). مبادئ الفلسفة الاسلامية، الرفاعي، عبد الجبار: (١٠/١).

هەروەها بەهۆی ئەوەی ئەوان لە زانستی ڕەوانبێژیدا پسپۆر بوون، توانییان شێوازێکی جوانی ئاخاوتن بەکاربێنن و بەمەش توانییان کار لە خەڵکی بکەن و بەهەڵەیاندا ببەن.

## هۆکاری گۆڕینی واتای وشەی «سۆفێستائی»

مێژوو باسی ئەوە دەکات کە ڕۆژێک لە ئەسینای پایتەختی یۆنان شۆڕەشێک لە دژی دەسەڵاتی زۆردار لە «بۆرژوازی، ئاغا، دەرەبەگ و دەوڵەمەندان» دەستی پێ کرد، دوای ئەوەی شۆڕش سەرکەوت و دەسەڵات لە دەسەڵاتی دکتاتۆرییەوە بۆ دەسەڵاتی ئازاد گۆڕدرا، چینی هەژاران و ئەو کەسانەی ستەمیان لێ کرابوو و موڵک و زەوییان لێ زەوتکرابوو، ویستییان تۆڵەی خۆیان لە چینی بۆرژوازی و گەندەڵکاران بکەنەوە و دادگاییان بکەن. لەو کاتەدا، لە یۆنان دادگاییکردن وابوو کە کۆمەڵە خەڵکێک کۆدەبوونەوە، لەگەڵ پارێزەری هەردوو لادا. جا کامیان بەسەر بەرانبەرەکەی سەرکەوتبووایە و بەڵگەی بەهێزتر بووایە، ئەوا جەماوەری ئامادەبوویان ڕازی دەکرد و وا بڕیاریان دەدا کە ئەو مافخوراوە و مافی ئەوە.

لەو کاتەوەی ئەو هەژارانە ویستییان چینی بۆرژوازی و ئاغاکان دادگایی بکەن، سۆفێستائییەکان هاتنە لای ئاغاکان تاوەکوو لەبەرانبەر کوژمەیەکی پارە (بەرتیل) بەرەنگارییان لێ بکەن و لەو بارە دەریان بکەن کە تێی کەوتوون. جا بەهۆی ئەو شارەزاییە نایابەی سۆفێستائییەکان هەیانبوو لە هونەری خەڵەتاندن و ساختەکردنی ڕاستییەکان بۆ ناحەقی و ناحەقی بۆ ڕاستی، تا بەرچاوی خەڵکی پێ تاریک بکەن، بەو شێوەیە بەرەنگارییان لەو ئاغا و زەنگینانە کرد و حەقییان پێ درا لەسەر تێچووی حەقی ئەو هەژارانە.

بەم شێوەیە، خەڵک باوەڕی پێیان نەما و بۆیان دەرکەوت کە فێڵبازن، بۆیە

واتای وشەی «سۆفیێست» لە «مامۆستای دانا» گۆڕدرا بۆ «کەسی فێڵباز».[١]

## جیاوازیی نێوان سەفسەتە (بەهەڵەدابردن) و بەهەڵەداچوون و هەڵەی لۆژیکی[٢]

چ کاتێک لە گفتوگۆدا دەڵێم ئەم زانایە سەفسەتەی کر (بەهەڵەدابردنی کرد) یان بەهەڵەدا چوو یان هەڵەیەکی لۆژیکی (موغالەتە)ی کرد؟ ئەم وشانە مانا و گرنگیی خۆیان لە زانستی کەلامدا هەیە، بەتایبەتییش لە زانستی کەلامی سەردەمدا پێویستە دروست بەکاربهێنرێن.

## سەفسەتە (بەهەڵەدابردن)

سەفسەتە ئەوەیە کە ڕاستییەک هەیە و باشیش دەزانیت ڕاستە، بەڵام بە مەبەست وشەیەکی لێ کەم دەکەیت یان زیاد دەکەیت، یان بە فێڵ و ساختەکاری گۆڕانێکی تێدا دەکەیت، یانیش بەمەبەست پێوانە و یاسایەکی لۆژیکی لەناو دەبەیت تا بتوانیت فکر و بیری خۆت بچەسپێنیت. ئێستاکە

---

(١) ینظر: تاریخ الفلسفة الیونانیة، یوسف کرم: (٥٧- ٥٨).

(٢) ١. سەفسەتە (بەهەڵەدابردن): کەسێک کارێک یان قسەیەک دەکات، دەزانێت کە هەڵەیە، بەڵام دەیکات، تا کەسانێک بخەڵەتێنێت و نامانجێک بەدەست بێنێت.
٢. بەهەڵەداچوون: کەسێک قسەیەک یان کارێکی هەڵە دەکات، خۆی وا دەزانێت کارێکی ڕاستە و هیچ مەبەستێکی خراپی وەک خەڵەتاندنی خەڵکی پێ نییە، بەڵام کارەکەی یان قسکەی هەڵەیە.
٣. هەڵەی لۆژیکی (مغالطە): کەسێک هەڵەیەکی لۆژیکی دەکات، ئێمە نازانین بۆ فێڵکردن کردوویەتی یان بەهەڵەداچووە، بەڵام هەڵەیە. (ئەم سێ پێناسەیە، وەرگێڕ لە ڕوونکردنەوەیەکی نووسەری وەرگرتووە.)

لە سەردەمی ئێمەدا، زۆر لە نووسەر و ڕۆشنبیرەکان ئەم ڕێگایە دەگرنە بەر تا لەپێناو بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆیاندا کەسانی تر بخەڵەتێنن. هەروەها لە وڵاتە زلهێزەکانی تریشدا دەبینین کە سەرۆکی وڵات بۆ مانەوەی خۆی لە دەسەڵاتدا، پرۆژە یاسایەک دەگۆڕێت، بۆ ئەمەش گشتپرسییەکی لەسەر ئەنجام دەدات و ئەم یاسایەی پێ هەموار دەکاتەوە. بەم شێوەیە، ماوەی مانەوەی خۆی لە دەسەڵاتدا درێژ دەکاتەوە.

نموونە لەسەر سەفسەتەی سیاسی: لەم دواییانەدا، دۆناڵد ترامپی سەرۆکی ئەمریکا و سەرۆکەکانی تری پێش ئەویش ئەم سەفسەتەیەیان ئەنجام داوە. کردارێکی سەبازی لە دژی ناوێکی تیرۆرستی لە دەڤەرێکی ڕۆژهەڵات ئەنجام دەدەن و ڕای دەگەیەنن کە کەسێکی تیرۆرستیان کوشتووە. بەڵام کەی ئەو کارەیان دەکەن؟ کاتێک وادەی هەڵبژارتنی سەرۆکایەتیی ئەمریکا نزیک دەبێتەوە، ئەم کارە سەربازییەیان ئەنجام دەدەن بۆ خەڵەتاندنی خەڵک و جەماوەرەکەیان لەپێناو مانەوەی خۆیان لە دەسەڵات و دووبارە هەڵبژاردنەوەیان. ئەمەش جۆرێکە لە سەفسەتەی سیاسی.

## بەهەڵەداچوون

واتا هەڵەکردن لە بەڵگەهێنانەوەدا، بەڵام بەبێ مەبەست. زۆرجار زانایەک، موجتەهیدێک، یان ڕۆشنبیرێک و ... هتد، دەبینیت بەڵگەهێنانەوەکەی هەڵەیە، بەڵام بیانوویەکی بۆ دەبینیتەوە و دەڵێیت: بەهەڵەداچووە و بەمەبەست وای نەکردووە، یانیش لەو ئاستەدا نییە کە ئەو ئیجتیهادە بکات. تۆ دەزانیت ئەم کەسایەتییە لە زۆرترین فکر و بیرەکانیدا ڕاستگۆ و ساخلەمە و ساختەکاری ناکات، بەڵام دەکرێت بە نەزانین کەوتبێتە بارێکی واوە.

سەفسەتە و هەڵە لە خاڵێکدا وەک یەکن و لە خاڵێکیشدا جیاوازن. خاڵی

هاوبەش لەنێوانیاندا ئەوەیە کە بەڵگەهێنانەوە و ئەنجامی هەردووکیان هەڵەیە. خاڵی جیاوازیشیان ئەوەیە کە لە «سەفسەتە»دا بەمەبەست هەڵە لە بەڵگەهێنانەوە و ئەنجمدا دەکرێت، بەڵام لە «بەهەڵەداچوون»دا بەهەڵە تێی کەوتووە و بێ مەبەستە.

## هەڵەی لۆژیکی (موغالەتە)

هەڵەی لۆژیکی ئەوەیە کە دەرەنجام و بەڵگەهێنانەوە و بیرکردنەوە هەڵە بێت و نەزانیت ئایا ئەم کەسە بێ مەبەست وای کردووە یان بەمەبەست؟! ئەگەر نەتزانی بێ مەبەست وای کردووە یان بەمەبەست، ئەو کاتە دەڵێیت ئەوە هەڵەی لۆژیکی و موغالەتەیە.

نموونە: نووسەرێک، بیرمەندێک، یان زانایەکی باوەڕپێکراو کە لە ڕابردوودا نووسین و بیروباوەڕەکانی باوەڕپێکراو بوونە و بەڕاستی نووسیبێت، بەڵام لە جێگایەکدا بەڵگەهێنانەوەکەی هەڵەیە، لەو کاتەدا چی دەڵێیت؟ بە مە ناڵێیت سەفسەتە (بەهەڵەدابردن)! چونکە لەم بەڵگەهێنانەوەیەدا هەڵەیە، بەڵام بەهەڵەدا چووە و بە مەبەست وای نەکردووە. بۆچی ئەوە دەڵێیت؟ چونکە لە ڕابردوودا تۆ ئاگاداری نووسین و بیروبۆچوونەکانی بوویت و دڵنیا بوویت کە کەسایەتییەکی ڕاست و دروستە. بۆیە پێویستە بڵێیت لەم بەڵگەهێنانەوەیەدا بەهەڵەدا چووە.

لەو لاوە، کەسایەتییەکی تر کە چەندین جار ساختەکاریی لێ گیراوە و چەندین جار ساختەکارییەکانی بە بەڵگەوە لە ڕاگەیاندنەکانەوە نیشاندراون و بڵاوکراونەتەوە، لەم کاتەدا دەزانیت کە ئەم کەسە بەمەبەست ئەم هەڵەیانەی ئەنجام داوە. لێرەدا پێی دەڵێین: ئەم کەسە سەفسەتەی ئەنجام داوە.

نموونە لەسەر کەسایەتی دووەم زۆرن و ڕۆژانە بە چاوی خۆمان دەبینین کە چەندین کەس بە ناوی ئیسلامی نوێ و مۆدێرن و سەردەم هاتوونە و لە ژمارەیەک لە پەرتووکەکانی خۆیاندا ئەو شتانەیان خستووەتە ڕوو. بەڵگەهێنانەوەیەکی هەڵەیان ئەنجام داوە و هەڵە و ساختەکاری گەورەیان لە شێوازی ڕێزمانی و زمانەوانیدا کردووە کە بە مەبەست ئەوەیان ئەنجام داوە. کەسەکە دەزانێت ئەو کارەی ئەنجامی داوە ساختەیە، بەڵام هەر دەیکات. لەو کەسانەش: موحەممەد شەحروور، ئەحمەد عەبدە ماهر، ئیسلام بحێری و ... هتد. ئەوە سەفسەتەیە، چونکە بە دەیان بەڵگەیان لەسەر هەیە کە ئایەتی قورئان و فەرموودە و قسەی زانایانیان ساختەکردوونە و بەو شێوازەی ویستوویانە، نووسیویانە و شیکاریان کردوونە. ئەمەشیان بە مەبەست کردووە، جا بە زانین بێت یان نەزانین. سەفسەتە ئاوایە، هەڵەیە و بە مەبەستیش هەڵەکە دەکات، بەڵام هەڵەی لۆژیکی (موغالەتە) نازانیت ئاخۆ مەبەستێکی لە پشتە یان نا.

بەڵام پێویستە ئێمە توانای عەقڵیمان هەبێت بۆ ئاشکراکردنی ئەو هەڵەیەی دەیکەن. توانای عەقڵییش بە ئەزموونێکی دوورودرێژ و سەلامەت لەناو ئەو زانستەدا دروست دەبێت. ئەگەر ئەو توانا عەقڵییەت نەبێت، دەکەویتە ناو هەڵەیەکی گەورەی زانستی و عەقڵییەوە.

## هۆکارەکانی دەرکەوتنی شەکی ڕێبازیی سۆفێستائییەکان

لەگەڵ ئەو هۆکارەی باسمان کرد، لەوەی کە سۆفێستائییەکان فێڵیان لە دادگا کرد و توانییان بە فێڵ و ڕەوانبێژیی خۆیان، کەسانی زۆردار بێتاوان دەربخەن و ئازاد بکەن، بەڵام هەندێک هۆکاری تریش هەبوون بۆ بڵاوبوونەوەی شەکی ڕێزبازیی سۆفێستائی. لەو هۆکارانەش:

هۆکاری یەکەم: پێش سۆفیستائییەکان باسوخواسێکی گەورەی فەلسەفی لەسەر بنەڕەتی بوون و چۆنییەتییەکەی هەبوو. هەندێک فەیلەسوف و قوتابخانەی فەلسەفی دەیانوت: "بنەڕەتی گەردوون، ئاوە." هەندێک فەیلەسوفی تر ئەوەیان ڕەت دەکردەوە و دەیانوت: "ئەسڵی بوون، هەوایە." هەندێکی تریش هەردوو بۆچوونەکەیان ڕەت دەکردەوە و دەیانوت: "بنەڕەتی بوون، ئاگرە."

ئەم باسوخواسە هەر بەردەوام بوو، بەم جۆرە زۆر جۆری فەلسەفە لەو دەمەدا پەیدابوون، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە فەلسەفەی ڕاست و دروست لەبەرچاوی قوتابیانی قوتابخانە فەلسەفییەکان لەسەر هەبوونی ڕاستیی ڕەها (الحقائق المطلقة) ون بکەن و شەکدار و گوماناوییان بکەن.

نموونەیەکی تر لەسەر ئەم بابەتە: کۆمەڵێک قوتابیی فەلسەفە لە قوتابخانەیەکی فەلسەفی دەیانخوێند و قوتابی بوون، لەو قوتابخانەیەدا بابەتێکیان دەخوێند کە دەیوت: "بوون لە یەک جەوهەر پێک دێت، ئەویش جەوهەری ماددییە." بۆ ڕاستی ئەو بابەتە، کۆمەڵێک بەڵگەی عەقڵییان نیشان دەدان و فێریان دەکردن و پێیان دەوت کە ئەم باسە ڕاستی و حەقیقەتە. قوتابییەکانیش بەوە ڕازی دەبوون کە ئەو شتەی قوتابخانەکەیان فێریان کردبوو، لە ئەوەی قوتابخانەکانی تری فەلسەفی ڕاستترە.

پاش ماوەیەکی تر و ڕۆیشتنی ئەم قوتابیانە بۆ قوتابخانەیەکی تری فەلسەفی، لەوێ دەیانبیست کە ئەم قوتابخانەیە دەڵێت: "ژیان لە یەک جەوهەر پێک دێت، ئەویش جەوهەری نموونەییە -میسالییە-."

ئەو قوتابخانەیەش بەڵگەی عەقڵییان لەسەر ڕاستیی وتەی خۆیان دەهێنا و ڕەخنەی توندیان لە بۆچوونی قوتابخانەی یەکەم دەگرت. جەختیشیان لەوە دەکردەوە کە حەقیقەت وەک قوتابخانەی یەکەم نییە، بەڵکوو هەڵەیە و ڕاستی

هەر لای قوتابخانەی دووەمە. بەم جۆرە قوتابییەکان فیکر و بیری یەکەمیان ڕەت دەکردەوە و باوەڕیان بە بیری قوتابخانەی دووەم دەهێنا و پەسەندیان دەکرد.[١]

دوای ماوەیەکی تر، ئەو قوتابیانە ڕوویان لە قوتابخانەی سێیەم کرد، ئەو قوتابخانەیە کۆمەڵێک بەڵگەی عەقڵی لەسەر هەمان بابەت دەهێنا و دەیوت: "بوون لە دوو جەوهەر پێک دێت، ئەوانیش جەوهەری: ماددی و میسالین." دووپاتیان لەوە دەکردەوە کە ڕاستی و حەقیقەت وەک ئەوانە و هەردوو قوتابخانەی یەکەم و دووەم هەڵەن. بەم جۆرە، قوتابییەکان کەوتنە ناو شەکێکی گەورە لەبارەی هەرسێ قوتابخانەکە، چونکە بۆچوونی دژیەکیان هەبوو و هەمووشیان بەڵگەی عەقڵییان هەبوولەسەر بۆچوونەکانیان. بۆیە ئەو قوتابیانە شەکیان لەسەر توانای عەقڵی بۆ پەیدا بوو و باوەڕیان بە ڕاستیی ڕەها نەما.

لێرەوە مێژووی شەکی ڕێبازی (الشک المزهبي) دەستی پێ کرد[٢] و

---

(١) تجدید المنهج في تعلیم الفلسفة، الیزدي: (١/١٦)، تاریخ الفلسفة الیونانیة، یوسف کرم: (٥٧- ٥٨)، و نظریة المعرفة عند مفکري الاسلام وفلاسفة الغرب المعاصرین، د. محمود زیدان: (٢٧- ٣٢).

(٢) ئەمە ئەوەیە کە مێژوو لەبارەی شەکی ڕێبازی بۆی باس کردووین. بەڵام شەکی ڕێژەیی (الشک الجزئي او النسبي) کۆنترە لە شەکی ڕێبازی. هەروەک لە لاپەڕەکانی پێشووتردا ئاماژەمان پێ دا. ئەگەر سەیرێکی قورئان بکەین، دەبینین مێژووی شەک لە شەیتانەوە دەستی پێ کردووە. کاتێک خودا ئادەمی (سەلامی خوای لێبێت) دروست کرد، فرمانی بە فریشتەکان کرد کڕنووشی ڕێزی بۆ ببەن، لەو کاتەدا شەیتان لەناو ڕیزی فریشتەکاندا بوو، ئەم فرمانەی ڕەت کردەوە، بە خودای وت: منت لە ئاگردروست کردووە و ئادەمت لە خاک دروست کردووە. من بەنرخترم لە ئەو. ئەوەی شەیتان کردی شەک بوو بەرانبەر تێڕوانینی خودا. پاشان شەکی خستە دڵی ئادەم، پاشان کوڕەکەی، پاشان قەومی نووح (سەلامی خوای لێ بێت) هەتا دوای نووحیش وا شەکیان دەبرد کە پێنج مرۆڤی باش دەبێت بپەرسترێن و کردیان بە بت و وەک خودا دایاننان. دواتر دوای ئەوەی شەکەکان زاڵ بوون، خودا پێغەمبەری بۆ گەلان نارد، تا شەکەکانیان ڕەت بکەنە و بیر و هزریان بنیات بنێن.

ئەو قوتابیانە کەوتنە ئەو بیرکردنەوەیەی کە ئەوانیش دەتوانن هەمان ڕێگا بەکاربێنن. دواتر پێکەوە کۆبوونەوە و بە یەکتریان وت کە هەر کەسێکیان دەتوان شتێک بکەن بە ڕاستی و حەقیقەت. لێرەوە بڕیاریان دا و وتیان کە هیچ ڕاستی و حەقیقەت لە بووندا نییە و عەقڵ دەتوانێت شتێک بکاتە ڕاستی و بە هەمان شێوەش دەتوانێت ئەو شتە بکاتە درۆ و شتێکی دوور لە ڕاستی و وا بڕیاری لەسەر بدات.

بەڵام گومان لەوەدا نییە کە هەر قوتابخانەیەکی هزری دەتوانێت کەسانێک بە کۆمەڵێک بەڵگە بخەڵەتێنێت. وەک قوتابخانەی هەستگەرایی، کاتێک توانیویەتی کەسانێک بە هەندێک بەڵگەی ماددی بخەڵەتێنێت کە "تەنیا هەستی مرۆڤ سەرچاوەی ڕاستین". قوتابخانەی (سوودگەرایی - pragmatism) یش بە چەند بەڵگەیەک بسەلمێنێت کە تەنیا سوود (المنفعة) سەرچاوەی ڕاستییە. قوتابخانەی ئەزموونییش بە هەمان شێوە، بۆیە سۆفیستائییەکان دەیانوت: "هیچ ڕاستییەک نییە، بەڵام عەقڵ دەتوانێت خەڵک بخەڵەتێنێت و شتێکی هەڵەیان لەبەرچاو بکاتە ڕاستی."

لەگەڵ ئەوەشدا، ئەمە نابێتە بەڵگە کە هیچ ڕاستییەکی ڕەها (الحقائق المطلقة) بوونی نییە و هەموو شتێک ڕێژەییە و هەموو قوتابخانەیاک دەتوانێت مرۆڤ بخەڵەتێنێت، بەڵام کێشە لە سادەیی ئەو کەسە دایە کە دەخەڵەتێندرێت. پێویستە مرۆڤ خاوەن هزر و بیر بێت، بتوانێت ڕەخنە لە بیروبۆچوونی هەڵە بگرێت و بتوانێت جیاوازی لەنێوان بەڵگەی ڕاست و هەڵە بکات.

هەروەها زۆر ڕاستیی ڕەها هەن لە ژیاندا کە عەقڵ دانی پێدا دەنێت و بە هیچ جۆرێک شەکی تێ ناکەوێت.

لەو ڕاستییە ڕەهایانەش: بوونی مرۆڤ کە ڕاستییەکی ڕەهایە و حاشای لێ ناکرێت. وەک دیکارت بە ڕێگای (کوجیتو – Cogito) بنەمای عەقڵی

و ژیان سەلماندوویەتی کە بوونی مرۆڤ ڕاستییەکی ڕەهایە. هەروەها ئیمام غەزالیی کەلامناس بە ٥٠٠ ساڵ پێش دیکارت، بە ڕێگای شەکی سیستمی (مەنهەجی) (الشک المنهجي) ئەو ڕاستییەی دووپات کردووەتەوە.

بە هەمان شێوە، بنەما عەقڵییە سەرەتاییەکان[١] هەموویان ڕاستیی ڕەهانە و شەکیان تێدا نییە، چونکە لە زانینی خوارسکی و فیترییەوە دروست بوونە. پشت بە خوا لە لاپەڕەکانی داهاتوودا بە شێوەیەکی لۆژیکی هەموو گومانکارییەکی سۆفێستائییەکان ڕەت دەکەینەوە.

هۆکاری دووەم: خاڵێکی تر، هۆکارێکی سیاسی هاوئاوێنەبوون لەپێناو خستنەڕووی ڕژێمی دیموکراتییە کە هونەری وتاربێژی و قەناعەتپێکردنی جەماوەری وەک داخوازییەکی سەرەکی لە ڕێبازی خۆیدا بەکارهێنا، تا بتوانن دەنگی خەڵکی بەدەستبێنن و بگەن بە دەسەڵات.[٢]

ئەو کاتەی دەسەڵاتی یۆنانی سیستمی دیموکراتی چەسپاند، سۆفێستائی دەرکەوتن و هاتنە گۆڕەپانی پایتەختی یۆنان و لەناو شار و شارۆچکەکانی یۆنان دەگەڕان و بەرانبەر بڕێک پارە وانەیان بە خەڵکی دەوتەوە، لەوانەش زمان و ئەدەب و هونەر، هەروەها زۆر گرنگییان بەم شتانەی خوارەوە دەدا:

١- ڕەوانبێژی و هونەری ئاخاوتن

٢ – گفتوگۆ و دانوستاندن

٣- بەچێژکردن و شیرینکردنی ئاخاوتن لەبەر دڵی خەڵکی و خەڵەتاندنیان

---

(١) ئەوانیش ئەمانەن: ١- بنەمای خودی، ٢- بنەمای نادژیەک، ٣- بنەمای ناوەندیی هەڵگیراو ٤-بنەمای هۆکاری

(٢) تاريخ الفلسفة اليونانية، يوسف كرم :٥٧.

٤- سەرخستنی بۆچوونی خۆیان بەسەر بەرانبەرەکەیان

٥- بێدەنگکردن و شکاندنی کەسی بەرانبەر

بەم ڕێگایە دەستیان بە سەفسەتە (بەهەڵەدابردن) کرد و سەفسەتەکەشیان بەڵگەهێنانەوەی ناتەواو و بەکارهێنانی شەک و ناڕاستی بوو بۆ لەناوبردنی هەر ڕاستی و ڕەوانییەکی باوەڕپێکراو. ئەمانەیان کردنە پێوەر بۆ خەڵەتاندنی جەماوەری ئەسینا، ئەم پێوەرەش پێکهاتبوو لە وەهم و ناڕاستی، بەڵام پێوەرکەیان لەسەرەوە جوان و ڕاست بوو و لە ناوەوەشدا فێڵبازی و خەڵەتاندن بوو.[١]

لە دواییدا، سۆفێستائی گەیشتن بەو ئەنجامەی بڵێن: ڕاستیی ڕەها و دڵنیا لە هیچ شوێنێکدا نییە و عەقڵ دەتوانێت شتەکان بکاتە ڕاستی بۆت و بەو ڕاستییەش بتخەڵەتێنێت. بەو واتایەی کە ڕاستییەکان هەمووی ڕێژەیین، بۆیە ئەو شتەی لای تۆ ڕاستییە، لای کەسێکی تر شەکە. وا بڕیاریان دا کە هیچ ڕاستییەک لە ژیاندا نییە و شەک لە هەموو شتەکاندا هەیە.

بە شێوەیەکی گشتی، لە سەردەمی سۆفێستائییەکاندا لایەنی شەک بەهێز بوو و بوو بە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی و ڕێبازێکی فەلسەفی، بەڵام دوای ئەوان لایەنی شەک لاواز بوو. ئەگەر هەندێک بیر و فکرەیشی لەلای هەندێک فەیلەسووفان مابووبن، بەڵام ئەوان وەک سۆفێستائییەکان ڕاستیی ڕەهایان ڕەت نەدەکردەوە و بانگەشەیان بۆ ڕێبازی شەکگەرایی نەدەکرد. بۆیە دەتوانین بڵێین شەکگەرایی سۆفێستائی لە هەموو شەکگەراییەکانی تر توندڕەوتر بوو، چونکە هیچ بنەمایەکی گونجاو و بنەجێ لای ئەوان بوونی نەبوو و هەموو شتێکیان دەکردە ڕێژەیی. بەڵام سەبارەت بە شەکگەرایی بیرۆنییەکان، ئەو شەکگەراییە خۆجێ نەبوو و نەیاندەتوانی هیچ حوکمێک بدەن، نە ئەرێنی و نە نەرێنی. بەڵام ڕێبازی شەکگەرایی ئەکادیمی مامناوەند

---

(١) تاريخ الفلسفة اليونانية، يوسف كرم :٥٧-٥٨.

بوو و لە ناوەندی هەردووکیاندا بوو، بەهۆی ئەوەی دوودڵ نەدەبوو، بۆ دانانی حوکم دەرکەوت و دەیتوانی بڕیار لەسەر بنەمای هەڵسەنگاندن بدات لەنێوان بۆچوونە جیاوازەکان و هەڵبژاردنی بۆچوونی بەهێزتر.

## تۆمەتبارکردنی سوقرات و ئەفلاتوون بە ڕێبازی شەکگەرایی

هەندێک نووسەر -بەهەڵەوە- دەڵێن کە سوقرات و ئەفلاتوون لەسەر ڕێبازی شەکگەرایی سۆفێستائی بەردەوام بوون، هەر وەک وتە بەناوبانگەکەی سوقرات کە هەندێک مێژوونووس وەک شەک لێی تێگەیشتن، کاتێک دەڵێت: "من هیچ شتێک نازانم ..."[١]

هەندێک نووسەر دەڵێن ئەفلاتوون یەکێک لە بانگخوازانی ڕێبازی شەکگەرایی بووە. لەبەرئەوەی گفتوگۆکانی ئەفلاتوون بە هەڵاوێستراوی ماونەتەوە، بێئەوەی کۆتاییان پێ بێت، یان بە ئەنجامێک بگەن! ئەوەش هەندێک کەسی هاندا تا بە دواکەوتەی ڕێبازی شەکگەرایی سۆفێستائی تۆمەتباری بکەن.[٢]

بەڵام ئێمە دەڵێین بیرکردنەوەی ئەو نووسەرانە هەڵەیە و دوورە لە ڕاستی، چونکە سوقرات و ئەفلاتوون و ئەرستۆ دامەزرێنەری قوتابخانەی فەلسەفەی عەقڵین و ڕوونە کە ڕێبازی فەلسەفەی عەقڵییش لەسەر چەند بنەمایەکی عەقڵی بنیاتنراون، ئەوانیش ئەمانەن:

١. بنەمای خودی

٢. بنەمای نادژیەکی

---

(١) تاريخ الفلسفة اليونانية : محمد مرحبا: (١٩٢).

(٢) تاريخ الفلسفة الغربية: برتراند راسل: (٣٥٠).

٣. بنەمای ناوەندیی هەڵگیراو

٤. بنەمای هۆکاریبوون

ئەم بنەمایانە هەموویان ڕاستیی ڕەهان و وەک زانینێکی خوارسکی و فیتری و زانستێکی یەقینی دەژمێردرێن. ئەم بنەمایانە دەبنە بەڵگە بۆ هەڵسەنگاندنی هەموو جۆرە زانیارییەک و نیشاندانی زانیاری ڕاست و هەڵە و، مەحاڵە شەک بکەوێتە ناو ئەم بنەما عەقڵییانە.

ئەم سێ فەیلەسووفە، ڕێبازی فەلسەفیی خۆیان لەسەر هەڵوەشاندنەوەی بەڵگەی سۆفیستائییەکان دانا. توانیشیان بەم بنەما عەقڵییانە بیری سۆفیستائی بۆ ماوەیەکی درێژ لاواز بکەن و لەناوی ببەن.

مێژوونووسەکان دووپات لەوە دەکەنەوە کە دوای ئەوەی سوقرات هات و شۆڕشێکی لە دژی سۆفیستائییەکان دەست پێ کرد و ڕووبەڕووی بیری ئەوان بوویەوە و فکری ئەوانی لاواز کرد، ئەوە بۆ خەڵکی ڕوونبوویەوە کە هەندێک ڕاستیی ڕەها لە ژیاندا هەن و هەموو شتێک ناکەوێتە ژێر شەکەوە. دواتر ئەفلاتوون هات و ئەویش بە بەڵگەی بڕاوە بیری سۆفیستائیی ڕەت کردەوە و دووپاتی لەوە کردەوە کە ڕاستییە ڕەهاکان هەن. دوای ئەویش ئەرستۆ هات و بناغەی زانستی لۆژیک (علم المنطق)ی دانا و توانی بە زانستی لۆژیکی، هزری سۆفیستائی هەڵوەشێنێتەوە.[1] بەڵام دوای مردنی ئەوان جارێکی تر بیری سۆفیستائی بە شێوازێکی تر گەڕایەوە. هۆکاری سەرەکیش بۆ گەڕانەوەی سۆفیستائییەکان، ڕۆڵی دەسەڵات بوو و لە پێناوی بەرژەوەندی و تەمەندرێژی دەسەڵات بوو، چونکە هەموو کاتێک کەسی زۆردار بیری سۆفیستائی بەکاردێنن بۆ خەڵەتاندنی خەڵک و ڕازیکردنیان بە زۆرداری و گەندەڵی.

---

(١) تاريخ الفلسفة من اقدم عصورها، حنا أسعد: (٨٧ -٩٢)، موسوعة المفاهيم الإسلامية العامة: (٣٤٦).

## جۆرە سەرەکییەکانی شەک

زۆربەی لێکۆڵەران لە بواری فەلسەفەدا بابەتی شەک بەسەر دوو جۆری سەرەکی دابەش دەکەن:

جۆری یەکەم: شەکی ڕێبازی (الشک المزهبي)

جۆری دووەم: شەکی سیستەمی (الشک المنهجي)




## جۆری یەکەم: شەکی ڕێبازی (الشک المزهبي)

لێکۆڵەرە شارەزاکانی بواری فەلسەفە بە چەند شێوازێک ئەم جۆرە شەکەیان دابەشکردووە. بە تێڕوانینی ئێمە، ئەم جۆرە بەسەر سێ بەشدا دابەش دەبێت:

یەکەم: شەکی ڕەها (الشک المطلق)

دووەم: شەکی سۆفێستائی

**سێیەم: شەکی ئەکادیمی**

**یەکەم: شەکی ڕەها (الشک المطلق)**

ئەو شەکەیە کە لە خودی خۆیدا دروست دەبێت، جا چ ئەرێنی بێت، چ نەرێنی[1].

نموونە: خاوەنەکانی ئەم شەکە دەڵێن: هەر شتێک لە ناخی خۆیدا دوو ڕاستی بۆ هەیە. وەک ئەوەی لە ناخی خۆیدا باشە و خراپیشە، جوانی و ناشرینیشی بۆ هەیە بە هەمان شێوە ... هتد. واتە، هەر شتێک لە ناخی خۆیدا دەکرێت ئەرێنی و نەرێنیش بێت. بۆیە دەڵێن: "عەقڵ ناتوانێت ئەوە بسەلمێنێت کە ئەو شتە ئەرێنییە یان نەرێنییە!" زۆر شتیش هەن دوو هۆکاریان هەیە، بەڵام عەڵ ناتوانێت بزانێت ئاخۆ کام هۆکار ڕاستتر و پەسەندترە؟ بۆیە دەڵێن: "شەک شتێکی ڕەهایە لە هەموو بوار و بۆچوونێکدا." بۆ نموونە: لە شەکی ڕەهادا عەقڵ نازانێت و ناتوانێت بڵێت کە ئایا کوشتن شتێکی باشە یان خراپە. بۆچی نازانێت؟ چونکە کوشتن لای ئەوان چەند شتێکی خراپە، ئەوەندەش لای کەسانێکی تر شتێکی باشە، بۆیە عەقڵ ناتوانێت بە شێوەیەکی ڕەها بڕیار بدات ئاخۆ کوشتن شتێکی باشە یان خراپ!

**دووەم: شەکی سۆفیستائی**

ئەم شەکە دەڵێت: ئێمە بە هیچ شێوەیەک ناتوانین بە مەعریفە بگەین و هەموو ڕێگاکانی گەیشتن بە مەعریفەش ڕەت دەکاتەوە. ئەم جۆرە شەکە هەموو زانینێک لەخۆ دەگرێت و گشتگیرە. ئەم شەکە لە خودی خۆیدا

---

(١) مدخل الی الفلسفة العامة، أ.د. حسن الشافعي: (٩٧).

مەبەستە نەک ڕێگا، خاوەنەکەی بە شەک دەست پێ دەکات و بە شەکیش کۆتایی پێ دێنێت. ئەو کەسانەی ئەمە دەکەنە پێوەر و دوای دەکەون، لەو باوەڕەدان کە هەوڵەکانی مرۆڤ بۆ گەیشتن بە مەعریفە (مەعریفەی یەقینی) شتێکی بێسوود و بێمەبەستە. زۆربەی لێکۆڵەرە فەلسەفییەکان ئەم شەکە بۆ سەر چەند جۆرێک دابەش دەکەن:[1]

أ- شەکی عیندی

ب- شەکی عینادی

ج- شەکی نەزانی

أ- شەکی عیندی (بە لای منەوە) (الشک العندي)

ئەم جۆرەی شەک دەڵێت کە ڕاستی و هەقیقەتی شتەکان تەنیا لە عەقڵی مرۆڤەکاندا هەیە و لە بووندا نییە. واتە: لە خودی مرۆڤدا حەقیقەتێک هەیە، بەڵام لە «بابەت» و «واقیعدا» هیچ ڕاستییەک بوونی نییە.[2] ئەوان دەڵێن دەکرێت حەقیقەت لە بیرتدا بێت، بەڵام ناتوانیت بیگەیەنیت بە کەسێکی تر. ئەو حەقیقەتەشی لە هزرتدایە، بۆ تۆ و بە لای تۆوە حەقیقەتە، نەک کەسێکی تر! ئەم بۆچوونە مرۆڤ دەکاتە پێوەری هەموو شتێک. سەرچاوەی ئەم ڕێبازەش بۆ «پرۆتاگۆراس» دەگەڕێتەوە کە دەڵێت: "مرۆڤ پێوەری هەموو شتێکە."[3]

---

(١) مدخل إلى الفلسفة العامة، أ.د. حسن الشافعي: (٩٨).

(٢) «خودی» واتە: لە بیری مرۆڤدا. «بابەتی» واتە: لە واقیعدا.

(٣) قضايا فلسفية، د. سعد الدين: (٨٥).

ب- شەکی «عینادی»

ئەم جۆرە دەڵێت کە هیچ حەقیقەت و ڕاستییەک لە بووندا نییە، نە لە بیری مرۆڤ و نە لە واقیعیشدا. واتا تۆ هەرچەند بیربکەیتەوە، ناگەیتە حەقیقەت، نە لە بیری خۆتدا و نە لە واقیعیشدا. ئەو کەسانەی لەسەر ئەم ڕێبازە دەڕۆن، بە عینادی و سەرڕەقییەوە هەموو ڕاستییەکان ڕەت دەکەنەوە و دەڵێن لە بنەڕەتدا هیچ ڕاستییەک بۆ بوون نییە. ئەم ڕێبازەش بۆ «گۆرگیاس» دەگەڕێتەوە کە دەڵێت: "هیچ ڕاستی و حەقیقەتێک لە بووندا نییە، ئەگەر ڕاستییەکیش هەبێت، هەر ناتوانین پێی بگەین. خۆ ئەگەر پێیشی بگەین، ناتوانین دووپاتی بکەینەوە و بۆ هیچ کەسێکی ڕوون بکەینەوە."[1]

ج- شەکی نازانمگەرایی (الشک اللاأدری)

خاوەنی ئەم جۆرە شەکە بەوە خۆیان لە شەکی عیندی و شەکی عینادی جیا دەکەنەوە کە خۆیان یەکلا ناکەنەوە. بە وتنی "نازانم" شەکی خۆیان بەجێهێشتووە. لەسەر بڕیارەکان دەوەستن، نە دەیسەلمێنن و نە ڕەتیشی دەکەنەوە. واتە: وەک یەک سەیری «سەلماندن» و «ڕەتکردنەوە» دەکەن. واتە: خۆیان یەکلا ناکەنەوە و ئەو هزر و بیرەیان بووەتە جۆرێکی نوێی شەک، هەر بەمەش لە دوو جۆرە شەکی پێشتر جیادەکرێنەوە.

سەرەڕای ئەوەی هەندێک لە کەلامناس و ئەهلی فەلسەفە، ئەم جۆرە شەکەی نازانمگەرایی (اللاادریة) بە جۆرە شەکێکی سۆفیستائی دادەنێن، بەڵام هەندێک لێکۆڵەر شەکی نازانمگەرایی (اللاادریة) لە شەکی سۆفیستائی جیا دەکەنەوە و بەسەر سێ بەش دابەشی دەکەن:

---

(١) قضایا فلسفیة، د. سعد الدین : ٨٧.

**بەشی یەکەم: نازانمگەرای لێکۆڵەر (اللأدري الباحث)**

نازانمگەرای لێکۆڵەر ئەو کەسەیە کە نازانێت ڕێی ڕاست چییە و کامەیە و بوونی «جیهانی میتافیزیکی» ڕاستییە یان نا، بەڵام بەدوایدا دەگەڕێت تا ڕاستییەکە بدۆزێتەوە. ئەم لێکۆڵەرە ئەگەر بەڕاستی گەڕان بکات، دەگاتە ڕاستی و حەقیقەت.

ئەمە بابەتێکی پەسەندکراوە، لە ئیسلامیشدا قبووڵکراوە و ڕێزلێگیراوە، قورئان دەفەرموێت: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُۥ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ﴾ [التوبە: ٦]

لە تێگەیشتنی ئایەتەکە دەبینین کە ئەگەر مرۆڤێک هاوەڵدانەر -یان کەسێکی بێدین- بێتە لات و داوای نیشتەجێبوونت لێ بکات، (لەوکاتە پێیان دەوت (استجارة) بەڵام ئێستا پێی دەڵێن «نیشتەجێبوون»)، و بیەوێت ئایینەکەت بزانێت، ئەوکات دەبێت نیشتەجێی بکەیت و جێگایەکی بۆ پەیدا بکەیت و بە باشترین شێواز ئایینەکەتی فێر بکەیت. ئەگەر باوەڕی هێنا تەواوە؛ ئەگەرنا، جارێکی تر دەبێت مافی ئەوی پێ بدەیت و تا بگەڕێتەوە شوێنی خۆی و نابێت ئازاری بدەیت و زۆری لێ بکەیت.

**بەشی دووەم: نازانمگەرای بێخەم (اللامبالي - غير مهتم)**

ئەو کەسەیە کە کێشە نییە بۆ ئەو بزانێت یان نەزانێت، وەک ڕێژەیەکی هەرە گەورەی خۆرئاوا، ئەگەر لێی بپرسیت و پێی بڵێیت: ئایین و باوەڕ شتێکی ڕاستن؟ پێت دەڵێت: نازانم. ئەگەر پێی بڵێیت کە ناڕاستیشە، هەر دەڵێت: نازانم! نەدەزانێت و نە دەیەوێت بزانێت، بەڵکوو خەمی گەورەی ئەوەیە لە کۆمەڵگەدا ناسیاو بێت و خۆشی وەرگرێت، جا بە هەر ڕێگایەکەوە بێت. ئەم جۆرە دژایەتی ئایینیش ناکەن، بەڵام کەسێکی لاڕێیە و نایەوێت ڕاستەڕێ بێت.

## بەشی سێیەم: نازانمگەرای ڕێبازی (اللاأدري المذهبي)

ئەمانەش هەمان بۆچوونی سۆفێستائییەکانیان هەیە، بەڵام جیاوازیی نێوان ئەمانە و سۆفێستائییەکان ئەوەیە کە سۆفێستائییەکان دەڵێن: هیچ حەقیقەتێک نییە و پێیشی ناگەین، بەڵام نازانمگەرا ڕێبازییەکان دەڵێن: ئێمە نازانین حەقیقەت هەیە یان نا؟ هیچ ڕێگایەکیش نییە بەهۆیەوە بزانین. ئەمەش زیاتر نزیکی سۆفێستائییەکانە، بەڵام لە لایەکیشەوە جیاوازن.

نموونە لەسەر نازانمگەرای ڕێبازی؛ ئەوان دەڵێن: ئێمە نازانین خودا هەیە یان نا. واتە دەڵێن: بەڵگەکانی ئیمان و بەڵگەکانی ئیلحاد وەک یەکن و لە یەک ئاستدان، بۆیە ناتوانین ئیمان بە دڵنیاتر لە ئیلحاد دابنێین. واتا ناتوانیت هیچ یەکێک لەم دووانە بەسەر ئەوەی تردا هەڵبژێریت!

**شەکی «نازانمگەرای ڕێبازی» پشت بە چەند خاڵێک دەبەستێت:**

**خاڵی یەکەم:** دەڵێن عەقڵ ناتوانێت سروشتی شتەکان بزانێت و هیچ کاتیش ناگات بەوە. بە تێڕوانینی ئەوان عەقڵ ناتوانێت بزانێت کە درۆکردن بەڕەهایی شتێکی باشە یان خراپ! واتا بۆ هەموو بەها باڵا ڕەوشتییەکان، عەقڵ نازانێت چی باشە و چی خراپە، چونکە لای ئەوان باش و خراپ وەک یەکە.

شوێنکەوتووانی هزری ئیلحادی نوێش هەمان بۆچوونیان هەیە و دەڵێن کە عەقڵ ناتوانێت بزانێت چ شتێک باشە و چ شتێک خراپە. عەقڵ نازانێت و ناشتوانێت بەها ڕەوشتییە ڕەهاکان هەڵبژێرێت، چونکە عەقڵ ڕێژەییە، ئەوەی بە لای تۆوە شتێکی خراپە، بە لای کەسێکی ترەوە شتێکی باشە.

نموونە لەسەر ئەمانە: کوشتن لای تۆ شتێکی خراپە، بەڵام کەسێکی تر بە باشی دەزانێت. کوشتنی کوردێک لای تۆ خراپە، چونکە کوردە و لە میللەتی تۆیە، بەڵام لای میللەتێکی تر باشە، چونکە میللەتی ئەو

نییە. کوشتنی مرۆڤێک لای کەسوکارەکەی خراپە، لە هەمان کاتدا لای دوژمنەکانییەوە شتێکی باشە. ئەوە هزر و بیرکردنەوەی هەموو فەیلەسووف و بیرمەندێکی ماددیگەرایە، وەک: «مارکس و لینین ستالین». زاناکانی ئیلحادی سەردەمیش، وەک: «ڕیتشارد داوکینز و سام هاریس و لۆرانس کراوس» هەمان بۆچوونیان هەیە.

نازانمگەرا ڕێبازییەکان و سۆفیستائییەکان هەروەک چۆن شەکیان لە شتی مەعنەوی هەیە، ئاواش شەکیان لە شتی ماددی هەیە. واتا نازانن کە من هەم یان نا، یان ئەو خۆیشی هەیە یان نا؟ هەموو شتێک لای ئەوان شەکە، دەکرێت ئەو هەبێت و دشکرێت نەبێت.

خاڵی دووەم: لە ڕێبازی نازانمگەراییدا (اللاأدرية): ئەوان لە بڕیاردان لەسەر هەر باسێکی گرێدراو بە بوون (ئەنتۆلۆژیا)، مەعریفە (ئیبستمۆلۆژیا) و بەها (ئیکسیۆلۆژیا) دەوەستن و ناتوانن نە بە ئەرێنی و نە بە نەرێنی بڕیاری لەسەر بدەن.

بەم جۆرە، ئەم ڕێبازە هانمان دەدات کە پێویستە مرۆڤ عەقڵی خۆی بوەستێنێت و نابێت مرۆڤ بگاتە ڕاستی و ناهێڵێت بیری مرۆڤ بە ڕۆڵی ساخلەمی خۆی بگات. ئەمەش ئەو شەڕەیە کە بۆ کۆنترۆلکردنی عەقڵی مرۆڤایاتی دەکرێت و تا ئێستاش بەردەوامە.

خاڵی سێیەم: ڕێبازی نازانمگەرایی (اللاأدرية) لەسەر خاڵی یەکەم و دووەمدا بینا دەکرێت: لە خاڵی یەکەمدا عەقڵ نازانێت چی باشە و چی خراپە. لە خاڵی دووەمدا عەقڵ دەیەوێت بوەستێت. خالی سێیەمیش لەکارخستنی عەقڵ و بەدوانەچوونی باسی مەعریفی، ئارامی لای مرۆڤ دروست دەکات. بۆیە وتیان کە ئەم ڕێبازەی نازانمگەرایی ڕێگایەکە بۆ گەیشتن بە خۆشی و ئارامیی دەروونی و لەلای ئەوان لوتکەی خۆشییە. لە ڕاستیشدا، ئەم

بۆچوونەی ئەوان گەورەترین بەهەڵەداچوونە، چونکە لەکارخستن و وەستانی عەقڵ دیسان کێشە بۆ مرۆڤ دروست دەکات.

## ڕەخنەی سۆفێستائییەکان لە هەستەوەرەکان و وەڵامدانەوەیان!

سۆفێستائییەکان زۆر ڕەخنە و تانەیان لە هەست و عەقڵ دەدا و دەیانوت کە نابێت بە هیچ جۆرێک باوەڕ بە هەستەکان بکەین، چونکە مەحاڵە بە هۆی هەستەوە بگەین بە مەعریفەی یەقینی.

بۆچی مەحاڵە؟ ئەوان چ بەڵگەیەکیان هەبوو؟

- دەڵێن مەحاڵە، چونکە لەو باوەڕەدان کە هەستەکان هەمیشە دەرکرێت فێڵیان لێ بکرێت.

بۆ نموونە دەڵێن: کاتێک لە ماڵی خۆتی و گوێت لە دەنگی منداڵێک بوو لە دەرەوە و وات هەست کرد کە دەنگی کوڕەکەتە، بەڵام کاتێک چوویتە دەرەوە و بینیت کوڕی دراوسێکەتە، ئا لێرەدا هەستەکانت هەڵە بوون و فێڵیان لێ کرا. بۆیە نابێت باوەڕیان پێ بێنین و بیانکەین بە سەرچاوەیەک بۆ دامەزراندنی مەعریفەی یەقینی.

لە وەڵامیاندا دەڵێین: بیروڕای ئەوان هەڵەیە و نابێتە بەڵگە بۆ ڕەتکردنەوی تەواوەتیی هەستەکان، چونکە هەستکردن بە دەنگی گریانی منداڵەکە دەبێتە ڕاستییێکی ڕەها کە کەسێک لە دەرەوەیە و دەگریێت، ناتوانین بە هیچ شێوەیەک شەکمان لەوە هەبێت، بەڵام بیرکردنەوەی ئەو بەوەی کە ئەو منداڵە کوڕی ئەوە، تەنیا بارودۆخێکی دەروونییە و پەیوەندیی بە هەستەکانەوە نییە. هەروەها لێکچوونی دەنگی گریانی منداڵەکان کاریگەری خستووەتە سەری.

- سۆفێستائییەکان تانەیەکی تریش لە هەستەکان دەدەن، بەڵگەیەکی

تر دەهێنن و دەڵێن: مرۆڤەکان لەیەکتر جودان و لە هەستکردندا هەریەکەیان پێچەوانەی یەکێکی ترە.

نموونە: کەسێکی نەخۆش کاتێک هەنگوێن دەخوات، هەست بە تاڵی دەکات، بەڵام کەسێکی ئاسایی هەست بە شیرینایی دەکات. بۆیە ئەوان دەڵێن: هەستەکان فێڵ ل مرۆڤ دەکەن و، گەیشتن بە ڕاستی لە ڕێگەی هەستەکانەوە ڕەت دەکەنەوە.

لە وەڵامیاندا دەڵێین: ئەوە نابێتە بەڵگە بۆ ڕەتکردنەوەی هەستەکان بەتەواوەتی، چونکە ساغ و ناساغەکە هەردووکیان هەست بەوە دەکەن کە ئەوە هەنگوێنە و تامی هەیە. ئەمەش ڕاستییەکی ڕەهایە و ناتوانین بە هیچ شێوەیەک شەکمان لێی هەبێت، بەڵام کەسی نەخۆش دەزانێت کە تامی هەنگوێنەکە بەهۆی نەساخییەکەیەوە تاڵ بووە و لە کاتی چاکبوونەوەیدا شیرین دەبێتەوە. واتە دەزانین کە ئەم تاڵێتییە شتێکی کاتییە و بەهۆی نەساخییەکەیەوەیە. هەر کاتێکیش چاک بوویەوە، جارێکی تر تامی هەنگوێنەکە شیرین دەبێتەوە. واتا شەکی لە شیرینی هەنگوین نییە، بەڵکوو دڵنیایە لەوەی کە تامی هەنگوین شیرینە.

تانەیەکی تر لە هەستەکان دەدەن بەوەی بەڵگەیەک دەهێنن و دەڵێن: کاتێک مرۆڤ خەونێک دەبینێت، وا هەست دەکات کە ڕاستی و حەقیقەتە، بەڵام کاتێک لە خەو هەڵدەستێت، دەزانێت کە ڕاستی نییە. ئەمە دەکەنە پێوەر و دەڵێن: چۆن دەکرێت ئەوەی لە خەوندا دەیبینیت، ڕاستی بێت؟ شەک لەوەدا نییە کە ئەوەی لە خەوندا دەیبینین خەوە و ڕاستی نییە، بەڵام مرۆڤ هەست بە بینینی خەوەکە دەکات و نەک ئەوەی لە واقیعدا بینیبێتی.

لە وەڵامدا دەڵێین: بەڕاستی ئەمە ڕەخنەیەکی زۆر لاوازە و لەجێی خۆیدا نییە بۆ ڕەتکردنەوەی سەرچاوەیێتی هەستەکان، چونکە ئەو زانایانەی هەستەکان

دەکەنە پێوەر، دەڵێن: هەستەکان دەبنە سەرچاوە، بەڵام لەژێر کۆنترۆڵی عەقڵەوە. واتە عەقڵ بڕیار دەدات ئاخۆ لە چ حاڵەتێکدا هەستەکان دەبنە سەرچاوە و لە چ حاڵەتێکدا نابنە سەرچاوە. جا بێگومان عەقڵ لە حاڵەتی خەوندا هەستەکان ناکاتە سەرچاوە.

ڕاستە هەستەکان لە هەندێک جێگادا دەخەڵەتێنرێن و نابێت ئەمە بەتەنیا بکەینە بەڵگە بۆ مەعریفەی یەقینی، بەڵام ئەمەش دەنگگدانەوەیەکی گەورەی لای ئەو فەیلەسووفانە پەیدا کردووە کە باوەڕیان بە هەبوونی «ڕاستیی ڕەها» هەیە، وەک: ئیمام غەزالی، دیکارت، بارکلی و ... هتد، بەڵام مەبەستی ئەم فەیلەسووفانە لەگەڵ سۆفیستائییەکاندا جیاوازە. لای ئەم فەیلەسووفانە، هەستەکان هەندێک جار بە شێوەیەکی کاتی فێڵیان لێ دەکرێت، لەبەرئەوە لەژێر کۆنترۆڵی عەقڵدا دەتوانن ببنە سەرچاوە. واتە عەقڵ بڕیار دەدات ئاخۆ ئەم هەستە ڕاستە یان نا. بۆیە ئەگەر هەستەکان لەژێر حوکمی عەقڵدا کار بکەن، ئەوا ئەو هەموو ڕەخنە و تانەیانەی سۆفیستائییەکان لە هەستەکان هەڵدەوەشێنرێنەوە.

## تانە و ڕەخنەی سۆفیستائییەکان ل عەقڵ!

سۆفیستائییەکان ئەم تانەیە لە عەقڵ دەدەن و دەڵێن: "هەر بەڵگەیەک هەبێت، ئەوا یان پشت بە بەڵگە سەرەتاییە سەلمێنراوەکان دەبەستێت، یان بەڵگە سەرەتاییە نەسەلمێندراوەکان" ئەگەر پشت بە بەڵگە سەرەتاییە سەلمێندراوەکان بەسترابێت، لەو کاتەدا پێویستی بە ئاشکراکردنی بەڵگەی ئەو بەڵگە سەلمێندراوە دەکات، ئەو بەڵگەیەش پێویستی بە بەڵگەیەکی ترە. بەم جۆرە دەبێتە زنجیرەیەک بەڵگەی بێکۆتایی، چونکە هەر بەڵگەیەک پێویستی بە بەڵگەیەکی تری پێش خۆی هەیە، تا دەبێتە زنجیرەیەکی بێکۆتا.

با ئەم بیروبۆچوونەیەیان بە شێوەیەکی سادەتر باس بکەین: عەقل نابێتە سەرچاوەی مەعریفە، چونکە دەبێت بەڵگە بێنیت کە عەقڵ سەرچاوەی مەعریفەیە، ئەو بەڵگەیەش پێویستی بە بەڵگەیەکی پێش خۆی هەیە، بەڵگەی پێش خۆیشی پێویستی بە بەڵگەیەکی تر هەیە، بەم جۆرە دەبێتە زنجیرە بەڵگەیەکی بێکۆتا.

بەڵام ئەگەر پشت بە بەڵگە سەرەتاییە نەسەلمێنراوەکان ببەستین، لەو کاتەدا مرۆڤ ناتوانێت هیچ شتێک بسەلمێنێت، لە هەردوو باریشدا، هیچ بەڵگەیەکی ڕاست ناسەلمێنرێن.

هەروەها تانەیەکی تر لە عەقڵ دەدەن و دەڵێن کە ناکرێت پشت بە عەقڵ ببەستیت بۆ سەلماندنی عەقڵ، چونکە دەکەوێتە ژێر «مەحاڵی بازنەیی» (استحالة الدور)، واتە عەقڵ خۆی نەسەلمێنراوە، کەوایە چۆن عەقڵ بکەین بە بەڵگە بۆ سەرچاوەبوونی عەقڵ؟ بەڵام ئەم بیروبۆچوونانەی سۆفیستائییەکان لەبارەی عەقڵ و هەستەکان بە خودی بەڵگەی عەقڵی و لۆژیکی ڕەتکراوەن و وەڵامیان دەدەینەوە.

## وەڵام بۆ ڕەخنەی سۆفیستائییەکان لە عەقڵ

دەربارەی ڕەخنەی ئەوان کە عەقڵ ناگاتە ڕاستیی هەموو شتێک و بەڵگە عەقڵییەکان باوەڕپێکراو نین، لەبەرئەوەی وەک ئاماژەمان پێ دا کە بەڵگە عەقڵییەکان دەبنە زنجیرە و مەحاڵی بازنیی (استحالة الدور) بەپێی بیروڕای ئەوان. ئەم بۆچوونەیان دوورە لە ڕاستی و لەجێی خۆیدا نییە، چونکە هەر چوار بنەما عەقڵییەکانی فەیلەسووفەکانی قوتابخانەی عەقڵگەرایی (سوقرات، ئەفلاتوون، ئەرستۆ و، دیکارت) دیاریان کردووە، کۆمەڵێک بنەمای ڕاست و ڕەهان و هەموو بەڵگەیەک لەسەر ئەمانە بنیات دەنرێن، ئەوانیش:

١- بنەمای خودی (مبدأ الهوية)

٢- بنەمای نادژیەک (مبدأ عدم التناقض)

٣- بنەمای ناوندیی هەڵگیراو (مبدأ الوسط المرفوع)

٤- بنەمای هۆکاری (مبدأ السببية)

ئەم چوار بنەمایە، کۆمەڵێک بنەمای ڕاست و ڕەهان و هەموو بەڵگەیەک لەسەر ئەمانە بنیات دەنرێن، چونکە ئەم بنەمایانە خوارسک و فیترین، لەگەڵ لەدایکبوونی مرۆڤ دروست دەبن. ئەمەش ڕاستییەکی گشتییە و لای هەموو مرۆڤێکی ئەم جیهانەدا هەیە، وەک زۆر لە زانایانی ئەنثروپۆلۆژی وسۆسیۆلۆژی دووپاتیان لێ کردووەتەوە[1]؛ بۆیە بە هیچ شێوازێک شەکیان لێ ناکرێت.

زۆر لە زاناکانی سەردەم کە شارەزا و پسپۆری زانستی ئەزموونین، ئەوە دووپات دەکەنەوە کە «بنەمای هۆکاری» دەکەوێتە ژێر بەڵگەی ئەزموونی، هەروەها چەندین بەڵگەی زانستی لەسەر بوونی زانینی خوارسک و فیتری هەن، لەو بەڵگانەش: زانا و پسپۆری ئەمریکی (دین هایمەر - Dean Hamer) کە پسپۆری زانستی ڕەچەڵەکە (علم الوراثة) لە زانکۆی هارڤارد، لە پەڕتووکەکەی خۆی بە ناوی (The God Gene) دا دەڵێت: "باوەڕبوون

---

(١) خوێندنەوە زانستییە سەردەمییەکان ئەوە دووپات دەکەنەوە کە بنەما عەقڵییە سەرەتاکان، وەک: بنەمای هۆکاری (مبدأ السببية): «بنەمای هۆکاری بوونی گەردوون» بە شێوەیەکی گشتی هەر ل کۆندا و تا ئێستاش لای هەموو مرۆڤەکان هەبوونە. بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەوەیە کە هیچ میللەتێک بێ ئایین نەبووە. زۆر لە زاناکانیش پشتیوانی ئەم بیرەیان کردووە. لەوانەش ژمارەیەک زانای ئەمریکی لە پەڕتووکی: (The Evidence of God in an Expanding Universe) کە باسی بوونی بەڵگەی خوارسکی (فطري) کردووە و دەڵێن: هزری بوونی هێزێکی گەورە کە کۆنترۆڵی گەردوون دەکات و بەڕێوەی دەبات، هزرێکی خوارسکە و خوا لە ناخی مرۆڤیدا چاندووە. هەروەها فەیلەسووفی مێژوونووس، «ویل دیورانت»، لە پەڕتووکی (قصة الحضارة)دا ئەوەی دووپات کردووەتەوە.

بە خودا شتێکی فیترییە و لە جیناتی مرۆڤدایە."

هەروەها زانا و پرۆفیسۆر، (جاستن بارێت - Justin Barrett) لێکۆڵەر لە سەنتەری ئەنثروپۆلۆژیا و مێشک، لە زانکۆی ئۆکسفۆرد، خاوەنی پەڕووکی بەناوبانگی: (Born Believers: The Science of Children's Religious Belief) دەڵێت: "دوای ئەوەی بۆ ماوەی بیست ساڵ لێکۆڵینەوەمان کرد، بەشێوەیەکی زانستی بۆمان ئاشکرا بوو کە منداڵ خاوەن باوەڕدارییەکی خوارسک و فیترییە، لەگەڵ هەبوونیاندا باوەڕ لە ناخیاندا هەیە."

بەم جۆرە، دیارە کە عەقڵ پشت بە بەڵگە سەرەتاییە سەلمێندراوەکان دەبەستێت، ئەوانیش بنەما فیترییەکانن لەو چوار بنەمایانەی باسمان کردن. ئەم بنەمایانە فیترین و لەسەر هیچ بەڵگەیەکی تر بنیاتنانرێن، بۆیە بەڵگە عەقڵییەکان نابنە زنجیرە و مەحاڵی بازنەیی (استحالة الدور).

ئایین، زانست، فەلسەفە و، عەقل؛ هەموویان ئەوە دووپات دەکەنەوە کە «بنەما عەقڵییەکان» بەگشتی و «بنەمای هۆکاری» بەتایبەتی، بنەمای خوارسک و فیترین لە مرۆڤدا، لە زگماکەوە لەگەڵ مرۆڤدان. واتە دەبنە ڕاستیی ڕەها، بۆیە پێویستە باوەڕ بە ڕاستییە ڕەهاکان بکرێت و نابێت گومانیان لێ بکرێت.

## چۆنیەتی گفتوگۆکردن لەگەڵ سۆفیستائییەکان

کاتێک شوێنکەوتووانی ڕێبازی سۆفیستائییەت بەعینادییەوە دەڵێن کە هیچ ڕاستییەکی ڕەها بوونی نییە و شەک لە هەموو شتێکدا هەیە! تۆ پێویستە پێی بڵێی: "ئەرێ ئەو قسەیەت ڕاستییە یان شەکە؟" ئەگەر وتی کە ڕاستییە، ئەوکات دژایەتی ڕێبازەکەی خۆی کردووە، چونکە پەسەندی کرد کە ڕاستییەک بوونی هەیە! ئەگەر وتیشی: "من شەکم لە قسەی خۆشم هەیە." دیسان دژایەتی ڕێبازەکەی خۆی کردووە، چونکە مادام شەکی لە قسەکەی خۆی هەبێت، ئەوکات قسەکەی ڕەت دەکرێتەوە و ناتوانین وەری بگرین.

## ڕێگاکانی گفتوگۆکردن لەگەڵ سۆفیستائییەکان

**یەکەم:** ڕێگای حاشاهەڵنەگر[1] (پێویستیی بە بەڵگەهێنانەوە نییە) ئەویش ئەوەیە، وەک زانایەک دەڵێت:

"زلەیەک لە کەسێکی سۆفیستائی بدە، ئەگەر خۆی تووڕە کرد و وتی: بۆچی وات کرد؟ پێی بڵێ: بۆچی خۆت تووڕە دەکەیت؟ کێ دەڵێت من بوومە کە لێتم داوە؟ ئەگەر وتی: دڵنیام کە تۆ بوویت لێت دام. ئەوکات پێی بڵێ: تۆ دژایەتی ڕێبازەکەی خۆتت کرد، چونکە یەقینت هەیە لە هەبوونێک ئەویش ئەوەیە کە من زلەم لێت دا. ئەگەر وتیشی: من شەکم لەوەیە کە تۆ زلەت لێدابم. ئەو کات زلەیەکی تریشی لێ بدە!"

کاتێک ئیمامی بەلخی گفتوگۆیەکی لەگەڵ کەسێکی سۆفیستائی کرد و گفتوگۆکەی سوودی نەبوو، دواتر بە قوتابییەکی خۆی وت: "بڕۆ پێڕۆکەی بدزە." کەسە سۆفیستائییەکە هاتە دەرەوە و پێڕۆکەی نەبینی، وتی: "کوا پێڕۆکەم؟ لێرە نییە!" ئیمامی بەلخی پێی وت: "دڵنیای لەوەی پێڕۆکەت هێنابوو یان نا؟" سۆفیستائییەکە وتی: "بەڵێ، دڵنیام." لەو دەمەدا ئیمامی بەڵخی وتی: "ئێمە بە تۆ وێراین!" واتا: تۆ دانت پێدا نا کە یەقین و دڵنیاییەک لە ژیاندا هەیە.

**دووەم:** پێویستە گفتوگۆ لەگەڵ سۆفیستائییەکاندا بکەین، بەڵام گفتوگۆی ئەوان پێویستی بە بنەما عەقڵییەکان نییە، چونکە هەرچەند بنەمای عەقڵی بۆ بێنیت، ئەو هەر شەکی لێ دەکات، بۆیە پێویستە تۆ ڕەخنە لە قسەکانی بگریت و بۆی بسەلمێنیت کە قسەکانی مرۆڤ ناتگەیەنن بە یەقین و قسەگەلێکی هەڵەن. ڕاستییەکەش ئەوەیە کە مرۆڤ دەگاتە دڵنیایی و یەقین، بەڵام چۆن؟ ئەوان دەڵێن

---

(١) زانینی حاشاهەڵنەگر: ئەو زانینە سادەیەیە کە هەموو مرۆڤێک هەیەتی و پێویستیی بە بەڵگە نییە و شەکیشی تێدا نییە، وەک ئەوەی دەڵێین ژمارە ٢ لە ژمارە ١ گەورەترە.

هەستەکانی مرۆڤ ناگەن بە ڕاستی و مەحاڵە. ئێمەش پێیان دەڵێین کە یاسایەکی لۆژیکی هەیە، دەڵێت: "نەگەیشتنت بە شتێک، مانای ئەوە نییە کە ئەو شتە نییە." بۆیە نەبوونی زانستت بە شتێک، مانای ئەوە نییە کە ئەو شتە نییە.

نموونە: تۆ نازانیت کێ ئەم کاتژمێرەی دروست کردووە، بەڵام نەزانینت مانای ئەوە نییە کە هیچ دروستکەرێکی نەبێت، چونکە هەبوونی دروستکەری کاتژمێرەکە ڕاستییەکی ڕەهایە، بەڵام دیارکردنی دروستکەرەکە ڕاستییەکی ڕێژەییە، دەکرێت بزانین و دەشکرێت نەزانین. کێشەی کەسانی سۆفیستائی ئەوەیە کە نەزانینی خۆیان دەکەنە بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەو شتە بوونی نییە. هەر وەک ئەوەی دروستکەری گەردوون ناناسن و دەڵێن گەردوون هیچ دروستکەرێکی نییە. ڕاستییەکەش ئەوەیە کە ئەمە هەڵەیەکی زۆر گەورەیە و دژی سادەترین بنەمای عەقڵی و لۆژیکییە. واتا هەبوونی دروستکەر ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگرە (پێویستی بە بەڵگەهێنانەوە نییە). بە سۆفیستائییەکان دەڵێین: نەگەیشتنیان بە ڕاستی، مانای ئەوە نادات کە ڕاستی و حەقیقەت بوونی نییە. ئەوە شتێکی حاشاهەڵنەگرە و شتێکی زگماکییە کە ئێمەی باوەڕدار پێی دەڵێین «خوارسک یان فیتری». فەیلەسووفە عەقڵییەکانیش پێی دەڵێن «بنەما عەقڵییە سەرەتاکان» کە سادەترین بنەما «بنەمای هۆکاری»یە، دەڵێت: "ڕووادنی هەر ڕووداوێک لە ئەنجامی هۆکارێکەوەیە."

نموونە: ئەگەر وشەیەکی ئینگلیزیت بینی، تێنەگەیت و پاشان بڵێیت: " بە هۆی من تێی ناگەم، بۆیە باوەڕم بەوە نییە کە نووسەرێکی هەبێت" ئەم قسەیە هەڵەیەکی سادەیە، با لێیشی تێنەگەیت، بەڵام پێویستە بزانیت کەسێک هەیە کە ئەم وشەیەی نووسیوە. با تۆش نەزانیت کێ نووسیویەتی و مانای چییە؟ بەڵام ئەم نەزانینە نابێتە بەڵگە بۆ ئەوەی کە هیچ نووسەرێک بۆ ئەم وشەیە نەبێت.

کێشەیەکی تری سۆفیستائییەکان ئەوەیە کە هەڵەی لۆژیکی دەکەن: تەنیا لەبەرئەوەی نازانن کێ نووسیویەتی، شەکیان لە هەبوونی نووسەر هەیە. تەنیا لەبەرئەوەی نازانن کێ ئەرز و ئاسمانی دروست کردووە، دێن شەک لە هەبوونی خودا دەکەن. یان لەبەرئەوەی مەبەستی هەبوونی گەردوون نازانن، دێن و دەڵێن: بوون هیچ مەبەستێکی نییە! بەم جۆرە، ئەگەر بێین و لێیان بڕوانین، دەبینین بیانووەکانیان هەمووی وەهم و بێبنەمان.

ڕێبازی سۆفیستائی هەمووی لەسەر ئەم خاڵانە بنیاتنراوە، عەقڵ وا پیشان دەدەن کە توانای ئەوەی نییە شتەکان لەیەکتر جیا بکاتەوە. پاشان دێن ڕۆڵی عەقڵ لەکار دەخەن و دەیکەن بە سەرچاوەی خۆشییەکان، ئەوەش پێچەوانەی تیۆری مەعریفەی دروستە.

## سێیەم: شەکی ئەکادیمی

هەندێک لێکۆڵەر ئەم جۆرە شەکە بە جۆرێکی سەربەخۆ دادەنێن، هەندێکی دیش دەیکەن بە بەشێک لە شەکی ڕێبازی (الشك المذهبي).

ئەمەش زاراوەیەکی فەلسەفییە -مەبەست پێی ئەکادیمیای زانستی نییە- خاوەنی ئەم جۆرە شەکە دەڵێن: هیچ شتێک لە بوونی خۆیدا یەقین نییە. بۆیە پێیان وایە بۆ هەر شتێک دوو تا سێ ئەگەر هەن، بەڵام ئەوان ئەگەری بەهێز وەردەگرن.[1]

لای ئەم ڕێبازە هیچ یەقینێک بوونی نییە. بەپێی پرسی یەقینیش، هەمان تێڕوانین و بۆچوونی هەیە لەگەڵ ڕێبازەکانی تردا، بەڵام بە ڕێگایەکی جیاوازتر. زۆرینەی پەیڕەوانی ئەم شەکە باوەڕیان بە هەبوونی خودا هەیە، بەڵام

---

(١) مدخل إلى الفلسفة، أ.د. حسن الشافعي: (٩٩).

بە ڕێژەیەكی ئەگەری. واتە ئەوان وا دەبینن كە هەبوونی خودا ئەگەرێكی بەهێزە. بەڵام ئەم بۆچوونە بەپێی بنەمای عەقڵی هەڵەیە و ڕەتكراوەیە، بەتایبەتییش بنەمای هۆكاری (مبدأ السببية).

چونكە باوەڕبوون بە هۆكارێك كە خودایە بۆ هەبوونی گەردوون، شتێكی یەقینییە. هەروەك فەیلەسووفانی قوتابخانەی عەقڵی دەڵێن: هەبوونی خودا بوونێكی فەرز و پێویستە (واجب الوجود). واتە عەقڵ دەڵێت: هەبوونی خوا پێویستییەكی عەقڵییە و نەبوونیشی مەحاڵە. بۆیە لە پرسی باوەڕدا، لای فەیلەسووف و زانایانی باوەڕداریش ئەمە جۆرێكە لە شەك و ڕەتكراوەیە و نابێت باوەڕمان پێی هەبێت.

شەكی ئەكادیمی لە هزری ئیسلامیدا، لە بواری بنەمای عەقیدەدا ڕەتكراوەیە، بەڵام لە بواری فیقهیدا پەسەندكراوە.

لە بواری بنەمای عەقیدەدا ڕەتكراوەیە، چونكە لە پرسی عەقیدەدا نابێت ٩٩٪ باوەڕت بە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێت) هەبێت و ١٪یش شەكت لێی هەبێت، بەڵكوو دەبێت ١٠٠٪ یەقینت پێی هەبێت. ئەمەش لەسەر بنەمای نەقڵ و عەقڵ و زانست بنیات نراوە. تەنیا لای مرۆڤی سادە و نەزان نەبێت، ئەوانەی كە توانای عەقڵییان تەواو نییە، یان زانیاری تەواویان وەرنەگرتووە. بۆیە دەكرێت ئەوان یەقینی تەواویان لەبارەی خواوە نەبێت.

بەڵام شەكی ئەكادیمی بۆ ئیجتیهاد و پرسە فیقهییەكانی (ظني) وەرگیراوە. لەبەر ئەوە لە بواری ئەحكامی شەرعیدا جیاوازیی لەنێوان زانایاندا دروست دەبێت.

## جۆری دووەم: شەکی سیستەمی (الشک منهجی)

پەیڕەوانی ئەم جۆرە شەکە باوەڕیان بە بوونی ڕاستیی ڕەها هەیە، بەڵام شەکیان لە ڕێگاکانی گەیشتن بە ئەنجامەکان (مەعریفەی ڕاستەقینە) هەیە.

ئەم جۆرە شەکە وا لە لێکۆڵەر دەکات کە بە ویست و توانای خۆی هەستێت بە ئەنجامدانی تاقیکردنەوە لەسەر ئەو هزر و زانیارییانەی لای ئەو هەن و هەوڵ بدات هەر هەڵەیەکی هزریی خۆی لەسەر ئەو بابەتە پاک بکاتەوە و دەیەوێت بگات بە ڕاستیی بابەتەکە.

سەرەڕای ئەمەش لای پەیڕەوانی شەکی مەنهەجی، مەعریفە ڕێی تێ دەچێت و عەقڵ لە توانایدا هەیە بگاتە ڕاستی و یەقین. ئەم شەکەش دەکەن بە ڕێگای گەیشتن بە یەقین و ڕاستیی ڕەها. زۆر لە فەیلەسووفانیش ئەم شەکەیان بۆ گەیشتن بە ڕاستییەکان بەکارهێناوە. لەوانەش: ئیمام غەزالی و دیکارت و کانت ... هتد[1].

بۆ نموونە: تۆ باوەڕت بەوە هەیە کە ڕاستی و یەقین بوونی هەیە، بەڵام شەکت لە ڕێگاکانی گەیشتن بەو ڕاستی و یەقینە هەیە. بۆ نموونە: کەسێکی ڕۆژئاوایی باوەڕی بەوە هەیە کە خودا هەیە. بەڵام شەکی لەوە هەیە کە ئایا کامە ڕێگا ڕاستەکەیە؟ ڕێگای ئایینی جوولەکە، یان مەسیحییەت یان ئیسلام؟ یانیش تۆ موسڵمانیت و دڵنیایت کە ئایینی ئیسلام ڕاست و دروستە، بەڵام کێشەیەکت هەیە، ئەویش ئەوەیە کە نازانیت کامە گرووپ و کۆمەڵە ڕاستە و بە شێوازێکی دروست نوێنەرایەتی ئیسلام دەکات؟ مەبەستمان لە یەقین ئەوە نییە کە چاولێکەر بێت بۆ یەقین، بەڵکوو دەیەوێت ئەو یەقینە لەسەر بنەمای عەقڵی و نەقڵی و بنیات نرابێت، نەوەک لەسەر بنەمایەکی چاولێکەریی کوێرانە.

---

(١) تمهید للفلسفة، د. حمدي زقزوق: (١٢٧).

ئەم جۆرە شەکە، شەکێکی پەسەندکراوە و پێویستە مرۆڤ هەیبێت، ئەگەر نەمانبێت، ئەوکات دەبین بە کەسانێکی چاولێکەر. ئەم جۆرە شەکە لە بواری زانستە ئەکادیمییەکاندا پەسەندکراوە. هەروەها لەلایەن زانستەکانی ئەزموونی و سایکولۆژی و سۆسیۆلۆژی پەسەندکراوە.

بۆیە زانستی کەلام، سەرەڕای بەڵگە نەقڵییەکان (قورئان و سوننەت)، هەوڵ دەدات بەڵگەکانی عەقڵی و لۆژیکی و زانستیش بەکاربهێنێت بۆ سەلماندنی بنەما عەقیدەییەکان، تا شەک لای کەسانی بێباوەڕ نەهێڵێت و ناچاریان بکات کە بە شێوازێکی عەقڵییانە دان بە ڕاستییەکانی باوەڕ بکەن.

بۆ نموونە: پزیشک و زانای فەڕەنسی د. مۆریس بوکای، خاوەنی پەڕتووکی: (القران والتوراة والإنجيل والعلم)، ئەم زانایە باوەڕی بە خوا هەبوو، بەڵام نەیدەزانی کامە ئایین ڕاستە، بۆیە «شەکی مەنهەجی»ی بەکارهێنا و لە کۆتاییدا گەیشتە ڕاستیی قورئان. هەروەها گەیشتە ئەوەی کە قورئان ڕاست و دروستە و لە هەموو لایەکەوە لەگەڵ زانستدا دەگونجێت، بەڵام تەورات و ئینجیل لە زۆربەی لایەنەکانەوە دژن لەگەڵ زانستدا. لێرەوە بۆمان ئاشکرا دەبێت کە ئەم جۆرەی «شەکی مەنهەجی» پێویستە ئەنجام بدرێت تا کەسانی بێباوەڕ و ڕێگا لێ ونبوو، بە ڕێگای ئەم جۆرە شەکەوە بگەن بە ڕاستی و یەقین و باوەڕ بە ئایینی ڕاست بهێنن.

## جیاوازیی نێوان شەکی ڕێبازی و شەکی مەنهەجی:

١. پەیڕەوانی شەکی ڕێبازی دەڵێن: هیچ ڕاستییەکی ڕەها بوونی نییە و ئەگەر هەشبن، ناتوانین پێی بگەین.

بەڵام پەیڕەوانی شەکی مەنهەجی دەڵێن: ڕاستییە ڕەهاکان هەن و دەشکرێت

پێیان بگەین، بەڵام لەبارەی ڕێگاکانی گەیشتن پێیان لە شەکداین، واتە بەدوای ئەوەدا دەگەڕێین ئاخۆ کامە ڕێگا باشترە بۆ گەیشتن بە ڕاستی.

**٢. شەکی ڕێبازی ئەوەیە کە مرۆڤ لە سەرەتادا شەکی هەیە و لە کۆتاییشدا هەر لە شەکدایە و هیچ کاتێک یەقینی بۆ دروست نابێت. واتە لە هەموو ژیانی خۆیدا و تا مردنیشی هەر لە شەکدایە!**

بەڵام شەکی مەنهەجی پێچەوانەیە. لە سەرەتادا شەکە، بەڵام لە کۆتاییدا مرۆڤ دەگاتە ڕاستی و حەقیقەت.

**٣. شەکی ڕێبازی هەڵوێستی نەرێنییە، چونکە بێئامانجە. بەڵام شەکی مەنهەجی هەڵوێستەکەی ئەرێنییە، چونکە ئامانجی ئەوەیە بەرەو یەقین بچێت و بگاتە ڕاستیی ڕەها.**

**٤. شەکی ڕێبازی مرۆڤ دەوەستێنێت و پەیڕەوانی دەڵێن کە لە دەستپێکدا هیچ یەقینێک بوونی نییە و مرۆڤیش ناتوانێت پێی بگات، هەتا بەدوایشیدا بگەڕێیت، هیچ کات ناگەیتە یەقین. بەمەش شەکی ڕێبازی عەقڵ و هزری مرۆڤەکان دەوەستێنێت و دوودڵی و وەسواسی بۆ مرۆڤ دروست دەبێت، واتە شەک کۆنترۆلی مرۆڤ دەکات.**

بەلام لە شەکی مەنهەجیدا مرۆڤ خۆی شەک بۆ خۆی دروست دەکات، واتە مرۆڤ کۆنترۆلی شەک دەکات.

**٥. لە شەکی ڕێبازیدا هیچ سەرچاوەیەکی دروست نییە بۆ گەیشتن بە مەعریفە. ئەوان سەرچاوەی وەحی و عەقڵ و هەست و ئەزموونەکان هەموویان ڕەت دەکەنەوە، واتە گەیشتن بە مەعریفە لە توانای مرۆڤدا نییە.**

بەڵام شەکی مەنهەجی باوەڕ بە سەرچاوەی مەعریفە دەهێنێت و باوەڕی

وایە كە مرۆڤ لە توانایدا هەیە بگاتە مەعریفە و ڕاستییە ڕەهاكان، بەڵام سەرچاوەی هەر قوتابخانەیەكی فەلسەفی و ئایینی جیاوازن لە یەكتر.

# بەشی دووەم

# سەفسەتە (بەهەڵەدابردن) و بەرهەمە مۆدێرنەکەی

لەم بەشەدا بەپێویستی دەزانین باسی بیری نوێخوازی (الفكر الحداثي) (Modernity) بکەین و بیخەینە ڕوو ئاخۆ ئەو فیکرەیە چ پەیوەندییەکی بە هزری سۆفیستائییەتەوە هەیە؟ هەروەها باسی چۆنیەتی ساخکردنەوە و نوێکردنەوەی «بیرۆکەی شەکگەرایی» بکەین لە بیری نوێخوازیدا.

لە لایەنی مێژووییەوە بە شێوەیەکی یەکلاکەرەوە دیار نییە کەی بیری نوێخوازی پەیدا بووە، هەندێک لێکۆڵەر دەڵێن: ئەم بیرە لە سەدەی پازدەدا، لە سەردەمی کۆڵۆمبس(Columbus)دا دەرکەوتووە، کاتێک گەیشتووەتە کیشوەری ئەمریکا. هەندێک لێکۆڵەری تر دەڵێن: هزری نوێخوازی لە سەدەی شازدەیەمەوە، لە سەردەمی شۆڕشی چاکسازیی پرۆتستانتەکاندا، لەسەر دەستی مارتن لوسەر (Martin Luther)دا دەرکەوتووە. هەندێکیش دەڵێن: نوێخوازی لە سەردەمی شۆڕشی فەڕەنسی دەرکەوتووە، بەڵام ئێمە زۆر گرنگی بە مێژووی دروستبوونییەوە نادەین، بەڵکوو هەموو گرنگیدانمان لەسەر شیکارکردنی چەمکەکە دەبێت.

## جیاوازیی نێوان نوێکاری و نوێخوازی

زاراوەی نوێکاری بە عەرەبی پێی دەڵێن (التحديث) و بە ئینگلیزی پێی دەڵێن (Modernization).

هەروەها، زاراوەی نوێخوازی بە عەرەبی پێی دەڵێن (الحداثة) و بە ئینگلیزی پێی دەڵێن (Modernity).

زۆر کەس جیاوازی لەنێوان زاراوەی نوێکردنەوە (التحديث) و نوێخوازی (الحداثة) ناکەن، وا بیردەکەنەوە کە هەردووکیان هەمان واتایان هەیە، بۆیە پێویستە جیاوازیی نێوان هەردوو زاراوەکە بخەینە ڕوو:

زاراوەی نوێکاری (التحديث): واتە نوێکاری لە بیری تەکنەلۆژی و بەرەوپێشبردنی کەرتی پیشەسازی بۆ ئاسانکردنی ژیان. واتە ئامانج لێی پێشکەوتنە لە لایەنی ماددی و تەکنەلۆژییەوە. بێگومان فیکرێکی باشە و پێویست بوو بکرێت، هەموو زانا موسڵمانەکانیش پشتیوانی ئەوە دەکەن و هیچ کەسێکیان دژایەتی ئەوە ناکات، چونکە فیکرێکی زانستی و شارستانییە، لە بەرژەوەندیی مرۆڤدایە و هیچ پەیوەندییەکی بە هیچ ئایدیۆلۆژیایەکی فیکرییەوە نییە.

زاراوەی نوێخوازی (الحداثة): بۆچوونێکی هزرییە و هەڵوێستێکی فەلسەفییە و خاوەن تیۆرییەکی مەعریفی (epistemology) تایبەتە.

نوێخوازی لەسەر فیکری ڕێژەیی (النسبيه) و ڕەتکردنەوەی ڕاستییە ڕەهاکان (الحقائق المطلقة) و بەها ڕەهاکان (القيم المطلقة) بنیاتنراوە. گرنگترین بۆچوونی ئەوەیە: «مرۆڤ دەکاتە سەنتەری بوون و سەرچاوەی زانین و دانەری بەها ڕەوشتییەکان.» واتە ئەم فیکرەیە نکۆڵی لە بوونی خودا و هەموو بنەما ئایینییەکان دەکات.

نوێخوازی هەوڵ دەدات کولتووری ئایینی و نەتەوەیی هەڵوەشێنێتەوە و هزر لەسەر بنەمای ماددیگەری و دوور لە بیری مێتافیزیکی و ئایینی نوێ بکرێتەوە. دەکرێت بیری نوێخوازی هەندێک خاڵی ئەرێنی هەبێت لە بواری گەشەپێدانی هزری و نەهێشتنی کولتووری بتپەرستی (وثني) و دەمارگیری،

بەڵام زۆرینەی خاڵەکانی نەرێنین، بەتایبەت لە بواری بەهای ڕەوشتی (القيم الاخلاقية) و بنەماکانی باوەڕ (أصول الإيمان).

وا دیارە نوێخوازی مرۆڤ دەکاتە سەنتەری بوون و دەیباتە ئاستی خودا، چونکە ئەو فیکرەیە کە بیروباوەڕی مرۆڤی کردە سەرچاوەی بەهادانان و هەموو زانین و مەعریفەی تری ڕەت کردەوە. هەروەها هەموو بابەتێکی پیرۆز (هەبوونی خودا، پەیامی پێغەمبەران، ئایین ...)ی کردە بابەتی دەستکردی مرۆڤ و مرۆڤایەتی و لە ڕاستییانی کردە دەرەوە.

## سەفسەتە (بەهەڵەدابردن) لە هزری نوێخوازیدا (الفكر الحداثي)

نوێخوازی (الحداثة - Modernity) لە بەرهەمی سەفسەتەی عیندییە، لێرەدا سەفسەتە نوێ بوویەوە، بەڵام ئەم جارە بە ناوێکی تر و شێوازێکی تر. سەفسەتەی عیندی هەموو ڕاستییەکی بابەتی ڕەت دەکاتەوە، تەنیا عەقڵی مرۆڤ دەتوانێت شت بکاتە ڕاستی و ناڕاستی، بەمەش هەموو شتێک دەبێتە ڕێژەیی. لە نوێخوازیشدا هەمان شتە، هیچ ڕاستییەک لە واقیعدا بوونی نییە، تەنیا عەقڵ دەتوانێت بڕیار بدات. واتە ئەگەر عەقڵی مرۆڤێک شتێکی کردە ڕاستی و عەقڵی، بەڵام مرۆڤێکی تر ئەو شتەی کردە ناڕاستی، ئەوکات هەردووکیان لە هەمان کاتدا ڕاستن، جا لێرەدا بەهێزترەکە سەردەکەوێت (بە هێزی لۆژیک نا، بەڵکوو بە لۆژیکی هێز) لەبەرئەوەش وڵاتە زلهێزەکان ئەم سیستەمە پەسەند دەکەن، چونکە لە بەرژەوەندیی ئەوانە.

## ڕێژەییەتی بەها ڕەوشتییەکان لە فیکری نوێخوازیدا

هەروەک ئاماژەمان پێدا کە هیچ ڕاستییەکی ڕەها لە هزری نوێخوازیدا بوونی نییە، بەڵکوو هەموو بەهاکان ڕێژەیین. دەکرێت لای هەندێک کەس لەشفرۆشی کارێکی خراپ بێت، بەڵام لە هەمان کاتدا لای هەندێک کەسی تر کارێکی باش بێت. لەبەرئەوەش فیکری نوێخوازی ڕێی بە لەشفرۆشی دا، ئەمڕۆ بە ملیۆنان ئافرەت کاری لەشفرۆشی دەکەن، ئەوەش بە شێوەیەکی یاسایی و دەستووری لەلایەن حوکوومەتەکانەوە ڕێی پێ دراوە. ئەگەر بپرسین ئاخۆ کوشتن کارێکی هەڵەیە یان دروست، ئەوکات بەپێی بەرژەوەندی بڕیاری لەسەر دەدرێت. ئەگەر ئەم کوشتنە بۆ تۆ و میللەتەکەت باش بێت، دەڵێیت کارێکی چاکە.

نموونەی زۆر لەسەر بابەتەکە هەن، بۆ نموونە: کاتێک ڕژێمی بەعس چەکی کیمیاوی لەسەر کورد بەکارهێنا، دەیان هەزار کەسی کوشت و سەدان هەزاری تری دەربەدەر کرد، ئەو کاتە ئەمریکا و نەتەوە یەکگرتووەکان هیچ هەڵوێستێکیان بەرانبەر ڕژێمی بەعس نەبوو. بەپێچەوانەوە، هەندێک وڵاتی زلهێز لە شەڕی دژی ئێران پشتیوانی بەعسیان کرد و چەک و تەقەمەنییان پێ فرۆشت. بەڵام دوای تێپەڕینی ١٥ ساڵ، ئەمریکا سەرلەنوێ خۆی لەسەر کاری بەعسییەکان ناڕازی کرد. ئەمەش بەهۆی ئەوەی بەرژەوەندیی لەگەڵ ڕژێمی بەعس نەما. واتە پێوەری ئەوان بەرژەوەندیخوازانەیە. هەر کەس بەرژەوەندیی ئەوانی تێدا بێت، پشتیوانی لێ دەکەن، ئەگەر بەرژەوەندیشیان لەگەڵدا نەما، دوژمنایەتیی دەکەن. هەر جێیەک بەرژەوەندیی ئەوانی لێ بێت، لەوێ دەبن. واتە پێوەری ئەوان بۆ ڕاستی و هەڵەی کارێک تەنیا بەرژەوەندیی ئەوانە.

نموونەیەکی سەردەم: لەبەر کوشتنی چوار کەسی سەر بە ڕۆژنامەی «شارلی ئیبدو» لە وڵاتی فەڕەنسا، زۆرینەی سەرۆکەکانی جیهان،

بەتایبەتییش سەرۆکە عەرەبەکان سەردانی فەڕەنسایان کرد. هەموویان ئەو کارەیان ئیدانە کرد و بە کارێکی تیرۆرستییان دانا، ئەمەش چونکە ئەو کوشتنە لە دژی بەرژەوەندییەکانی فەڕەنسا و وڵاتە زلهێزەکان بوو. هەرچەندە لە هەمان دەمدا ملیۆنان خەڵکی سووریا کوژران و دەیان شار خاپوور کران بە بەرمیلی (T.N.T)، زۆر جاری تر خەڵکی سڤیل کیمیاباران کراون و نەتەوە یەکگرتووەکانیش پشتڕاستیان کردووەتەوە کە چەکی کۆمەڵکوژ لە دژی خەڵکی سڤیل بەکارهێنراوە، دەیان ملیۆن کەس دەربەدەر کراون، ئێستاشی لەگەڵدا بێت نە نەتەوە یەکگرتووەکان و نە سەرۆکەکانی جیهان نەیانوتووە کە کارێکی هەڵەیە. ئەمەش لەبەرئەوەی مانەوەی ڕژێمی سووریا لە بەرژەوەندیی ئەواندایە، پێچەوانەی ئەمەش چەندین وڵاتی زلهێز و زۆربەی وڵاتانی ئەورووپاش پشتیوانیی خۆیان بۆ ڕژێمی سووریا پیشان دا و نەتەوە یەکگرتووەکانیش پەسەندی کرد کە بەشار ئەسەد سەرۆکێکی شەرعییە، ئەوانەشی شۆڕشیان ئەنجامداوە تیرۆرستن و گەیشتنە سزای خۆیان.

هەروەها کوشتنی سەدان هەزار کەس لە میانمار و دەیان هەزار کەسیش لە وڵاتی مالی لەسەر دەستی توندڕەوە مەسیحییەکان کوژران، کەسیش ئەم کوشتنانەی ئیدانە نەکرد، چونکە ئەوانەی کوژرابوون، موسڵمان بوون و لە بەرژەوەندیی ڕۆژئاوادا بوو، بۆیە ڕۆژئاوا دەنگی لێوە نەهات.

بەم هۆیەوە کاتێک بڕیار ڕێژەیی بێت، کارەساتی گەورە ڕوودەدەن. بۆ نموونە، کاتێک ئەورووپییەکان ڕۆیشتن بۆ کیشوەری ئەمریکا، ویل دیورانت و زۆر لە مێژوونووسان دەڵێن کە دەیان ملیۆن هیندییە سوورەکانیان کوشت[1] ئەمەش لەبەرئەوەی بەپێی عەقڵی ئەورووپییەکان ئەمانە بە کەڵکی شارستانییەت نایەن و پێویستە بکوژرێن، بەڵام بەپێی عەقڵی هیندییە سوورەکان داگیرکردنی

---

(١) (الغرب والعالم) كافين رايلي: ٢/١٠٦ - ١٠٧. (المسيحية والسيف) بروتولومي دي لاس: ٢٣- ٢٥.

زەویی ئەوان و كوشتنیان زۆرداری بووە لێیان كراوە.

لێرەدا دژیەكیی هزری دروست بوو، بەڵام ئەوەی بەهێز بوو سەركەوت. كەواتە مادام هیچ ڕاستییەكی ڕەها نییە كە كوشتن شتێكی هەڵە بێت، بڕیاریش ڕێژەیی بێت، ئەوكات لایەنی بەهێز (ئەورووپییەكان) سەردەكەوێت، بەڵام بە لۆژیكی هێز، نەك هێزی لۆژیك. تەنانەت هەندێك مێژوونووس دەڵێن كە پەنجا ملیۆن لە هیندییە سوورەكان كوژران.

سەرەڕای ئەوەی لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا، حوكوومەتی ئەمریكا لە ژێر دروشمی: (تطهير الأرحام من الألغام – پاككردنەوەی زگی هیندییە سوورەكان لە مینەكان) هەستان بە دانانی ڤاكسینی نەزۆكی بۆ ئەو ئافرەتانەی هیندییە سوورەكان كە لە ژیاندا ماون، بۆئەوەی منداڵیان نەبێت، ژنەكانیشیان ناچاركرد بە دانانی ئەو ڤاكسینە.[1] هەمووو ئەمەش لەسەر دەستی ئەمریكای پێشكەوتووی خاوەن شارستانییەت كە سێكیولاریزمەكان دەسەڵاتیان دەكرد، بەڵام لە فیكری نوێخوازیدا ئەمە كارێكی باش بوو، چونكە لە تێڕوانینی ئەواندا هیندییە سوورەكان بەكەڵكی شارستانییەت ناهێن و پێویستە بمرن.

هەروەها پێش ئەوەی شۆڕشی زانستی و تەكنەلۆژیا لە جیهان سەر هەڵبدات، ئەورووپییەكان بە دەیان ملیۆن ئەفریقییان كرد بە كۆیلە و بە ملیۆنان كۆیلەی ئەفریقی لە برسا و لەبەر نەخۆشی لەژێر ئەشكەنجەی مردندا بوون. ئەوەشیان پێ ڕاست بوو، چونكە لە بەرژەوەندیی ئەورووپییەكاندا بوو.[2]

---

(١) (أمريكا و الإبادة الجنسية): (٦٠- ٦١).

(٢) (الغرب والعالم) كافين رايلى: ١٠٦- ١٠٧.

## کۆیلایەتیی سەردەم لە فیکری نوێخوازیدا

فیکری نوێخوازی -لەپێناو بەرژەوەندیی دەسەڵاتدارە ڕۆژئاواییەکاندا- کۆیلایەتی تاکەکەسیی نەهێشت، بەڵام جۆرێکی تری کۆیلایەتی بەرهەم هێنا، ئەویش کۆیلایەتی داگیرکردنی گەل و وڵاتەکان بوو، کۆیلایەتی بازرگانیکردن بە ملیۆنان کچ لە ڕێگای لەشفرۆشی، کۆیلایەتی هەژارکردنی وڵاتان و چەسپاندنی بڕیاری بانکی نێودەوڵەتی بوو بەسەریان ... هتد.

پێویستە بزانین کە ئەمریکا یەکەم وڵات نەبوو کۆیلەکانی ئازاد کردن، بەڵکوو چەندین وڵات بەر لە ئەمریکا بڕیاری ئازادکردنی کۆیلەکانی داوە، وەک دانیمارک لە ساڵی ١٧٩٢ بڕیاری ئازادکردنی کۆیلەکانی دا. لە ساڵی ١٨١٤ کۆمەڵێک وڵاتی ئەورووپی لە کۆنگرەی ڤییەننا بڕیاریان دا کە دەبێت سنوورێک بۆ کۆیلایەتی دابنرێت. لە ساڵی١٨٣٤یش لە وڵاتی کەنەدا کۆیلکان ئازاد کران و دواتریش لە ساڵی ١٨٦٥ سەرۆکی ئەمریکا «ئەبراهام لینکوڵن» لەبەر چەند هۆکارێکی سیاسی -لەوانەش یەکگرتنی ئەمریکا- بڕیاری ئازادکردنی کۆیلەکانی دا. هەر وەک «لینکۆڵن» دەڵێت: "ئەگەر توانیبام بێ ئازادکردنی کۆیلەکان یەکگرتوویی ئەمریکا بپارێزم، کۆیلەکانم ئازاد نەدەکردن ..."

زانای ناودار، «جون هنریک کلاک» ئەوەی لە پەڕتووکەکەیدا بە ناوی (تجارە الرق والرقیق) دووپات کردووەتەوە.

دەبێت ئەوەش بزانین کە کۆیلەکان لەبەر هۆکاری مرۆڤایەتی و مرۆڤدۆستی ئازاد نەکران، بەڵکوو هۆکاری ئازادکردنیان بۆ گەشەپێدان و پێشکەوتنی بواری پیشەسازی دەگەڕێتەوە، کاتێک ئامێر و ئامرازەکان پەیدا بوون، توانییان بە ئامێرێک کاری دەیان کۆیلە بکەن، بۆیە کۆیلە بۆ ئەوان بوون بە بارگرانی و پێویستییان پێ نەما. بەمەش، ڕۆژئاوا دەستی لە کۆیلایەتی

تاکەکەسی بەردا و دەستی کردە بەکۆیلەکردنی گەل و وڵاتەکان لە ڕێگای داگیرکارییەوە. هەروەک بەریتانیا لە ماوەی سەد ساڵدا، وڵاتی هیندستانی داگیر کرد و مامەڵەی کۆیلەیان لەگەڵیاندا دەکرد. هەروەها ئەمریکا و وڵاتە ئەورووپییەکان دەیان ساڵ وڵاتە عەرەبییەکانیان داگیر کردبوون، مامەڵەی کۆیلەیان لەگەڵیاندا دەکرد، هەموو بەرهەمی نەوتیان لەژێر دەسەڵاتی ئەواندا بوو و زۆرینەی سوودیشی هەر بۆ ئەوان بوو. ئینجا دەستیان بەسەر وڵاتە ئەفریقییەکاندا گرت و ئەو زێڕ و دەرامەت و سامانەی هەیانبوو، بردیان و هێشتیان ئەفریقییەکان لەبرسا بمرن. بەڵام هەموو ئەو کارەیان بە ڕاست دەزانی و بەرهەڵستی و پارێزگاریکردن و شۆڕشەکانی دژی زۆرداریيشیان بە تیرۆر ناوزەند دەکرد.

کۆیلایەتی تا ئێستاش بەردەوامە، بەڵام بە شێوازی جیاواز لە جاران.

ئەرێ ئەوە بەکۆیلەکردن نییە ئێستا لە جیهاندا بازرگانیی لەشفرۆشی بە دەیان ملیۆن کچ دەکرێت؟

ئەی ئەوەی دەیان ملیۆن کەس مێشکیان لەدست داوە و بوونەتە کۆیلەی مادده هۆشبەرەکان؟

یان ئەوەی نزیکەی یەک ملیار کەس لە جیهاندا لەژێر هێلی هەژاریدان؟

ئەی دەربارەی ئەوەی ئێستا چەندین وەلات دەسەڵاتی خۆیان لەدەست داوە و لەژێر بڕیاری بانکی نێودەوڵەتی کار دەکەن؟ ئەمەش بەهۆی زیادبوونی قەرز لەسەریان.

یان ئەوە بەکۆیلەکردن نییە بە دەیان هەزار منداڵی هەتیو -لە وڵاتە ئەورووپییەکان- بێنە پەروەردە و ئامادە بکرێن بۆ سەربازیکردنی بەزۆری و شەڕیان پێ بکرێت؟

هەموو ئەمانە بە شێوەیەکی فەرمی دەکرێن و هەمووشیان لەژێر دەسەڵاتی وڵاتە زلهێزەکانەوە دەکرێن لەپێناو بەرژەوەندیی ڕۆژئاوادا.

## هزری نوێخوازی و پەسهندکرنی هاودژە عەقلییەکان

بیری نوێخوازی وا بڕیار دەدات کە هیچ ڕاستییەکی مەعریفی ڕەها لە واقیعدا بوونی نییە. سەرچاوەی مەعریفە تەنیا عەقڵە و عەقڵیش لەناو خۆیدا دەتوانێت بڕیار بدات کە چی باش و ڕاستە، چییش خراپ و هەڵەیە، بەڵام عەقڵ ناتوانێت لە واقیعدا بگاتە ڕاستی و بڕیار لەسەر شتەکان بدات.

بەم جۆرە، ڕاستییە مەعریفییەکان بەپێی بڕیاری عەقڵ دەبنە شتێکی ڕێژەیی، واتە ئەگەر عەقڵت بڕیاری لەسەر باشیی کارێک دا، ئەو کارە باش دەبێت و لە هەمان کاتدا ئەگەر عەقڵی کەسێکی تر کارەکەی بە خراپ زانی، ئەوکات بە کارێکی خراپ دادەنرێت. لای تۆوە باش دەبێت و لای ئەو خراپ.

ڕوونە کە ئەو فیکرەیە دژی بنەما عەقڵی و لۆژیکییەکانە، یەک لەوانیش «بنەما نادژیەکەکان»ە، واتا مەحاڵە دوو شتی دژ لە یەک کاتدا کۆببنەوە. بۆیە بیری نوێخوازی -هەرچەندە باوەڕی بە هیچ ئایینێک نییە- دەڵێت هەموو ئایینەکان ڕاستن -واتا هەر ئایینێک لای شوێنکەوتووانییەوە ڕاستە. بۆ نموونە، ئایینی زەردەشتی لای زەردەشتییەکانەوە ڕاستە، ئایینی جوولەکە لای جوولەکەکانەوە ڕاستە، ئایینی مەسیحییەت لای مەسیحییەکانەوە ڕاستە، ئایینی ئیسلام لای موسڵمانەکانە ڕاستە، ئیلحاد لای بێباوەڕانەوە و مولحیدانەوە ڕاستە.- بەم جۆرە بیری نوێخوازی دەڵێت: هەموو ئایینەکان ڕاستن و خوداش ڕاستە.

ئا ئەوەیە هەڵەی گەورە، چۆن دەکرێت ئەم فیکرانە هەموویان دژیەک بن و

لە هەمان کاتیشدا هەموویان ڕاست بن. ئەمە دژی بنەمای عەقڵ و لۆژیکە. چۆن دەکرێت ئایینێک بڵێت یەک خودا هەیە، یەکێکی تر بڵێت دوو خودا هەن و ئەوەی تریان بڵێت سێ خودا هەن، دانەیەکیشیان بڵێت ئەسڵەن هیچ خودایەک بوونی نییە، .هەمووشیان ڕاست بن؟!

لەم سەردەمەدا، ئەم فیکرەیە لە جیهان بەگشتی و لە وڵاتانی ئیسلامیش بەتایبەتی بەشێوەیەکی سیستەمی و بەرنامە بۆ داڕێژراوی جێبەجێ دەکرێت. هەر وەک ئێستا لە وڵاتی ئیمارات دەستی پێ کردووە و بیری ئایینی ئیبراهیمی بڵاو دەکەنەوە کە ئایینێکی یەکگرتووە لە هەرسێ ئایینەکان (جوولەکایەتی، مەسیحیەت، ئیسلام) پێکهاتووە.

لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندندا زۆر کار دەکرێت تاوەکوو ئەم بیرە لەژێر هەر ناوێکدا بێت بڵاوی بکەنەو و بەتایبەتی لە ڕێگای «پێکەوە ژیان»ەوە. تا گەیشتووەتە ئەو ڕادەیەی لە بەرنامەیەکدا بێژەری بەرنامەکە بڵێت: "ئایا توندڕەوی نییە بڵێین ئایینەکانی تر هەڵەن!"

باشە ئەگەر وا بیربکاتەوە کە هەموو ئایینەکان ڕاستن، وەک ئایینی ئیبراهیمی، بۆچی ناچێتە ناو ئەو ئایینە؟ ئینجا جیا لە لایەنی ئایینی کە ئەم فیکرەیە هەڵەیە، بەڵکوو دژی بنەمای عەقڵییشە، بەتایبەت «بنەمای نادژیەک» ئەو کەسەی ئەوە دەڵێت، تەواو مێشکی خۆی لەدەستداوە، چونکە بنەما عەقڵییەکانی ڕەتکردنەوە. ئەوانەش هەندێک ڕێخۆشکەرن بۆ یەکگرتنی ئایینەکان. بۆیە ئەم کەسانە ئاگایان لە خۆیان بێت یان نا، مەبەستیان ئەوە بێت یان نا، ئەوا ئەوان بەم ڕێگایە بەرەو یەکگرتنی ئایینەکان (وحدة الأديان) دەچن.

هزری نوێخوازی و تیۆری «ململانێ لەپێناو مانەوە - الصراع من أجل البقاء»

هزری نوێخوازی -هەرچەندە دەڵێت کە هیچ ڕاستییەکی ڕەها بوونی نییە- باوەڕێکی ڕەها بە تیۆری پەرەسەندن (نظرية التطور) دەهێنێت،[1] نموونەش بە خوێندنی «هەڵبژاردنی سروشتی - Natural selection» ناوەڕۆکەکەشی ئەوەیە کە مانەوە بۆ باشترینەکانە، مەبەست لە باشترینیش ئەو گیانلەبەر و مرۆڤانەن کە بەهێزترن بۆ ململانێکردن لەسەر مانەوە لە ژیان. چارلس داروین (Charles Darwin) لە تیۆرییەکەیدا، لە پەڕتووکی (أصل الأنسان)دا بڵاوی کردووەتەوە و دەڵێت: "ڕەگەزی ئەفریقی زۆر پەرەی نەسەندووە و هێشتا نزیکن لە مەیموون، بەڵام ڕەگەزی ئەورووپی بەرزترین ڕەگەزە، لەبەرەوە دەبێت ڕەگەزی ئەورووپی کۆنترۆڵی جیهان بکات."[2] هەروەها داروین پێشبینی ئەوەی کرد کە توخمی ئەورووپی لە ڕەگەزی سپی و پێشکەوتوو کۆنترۆڵی جیهان دەکەن. ئەم بیرەش زۆر باش بوو ببێتە بابەتی خوێندن بۆ ئەورووپییەکان.

---

(١) چارلس داروین (Charles Darwin) دەڵێت: "هەموو بوونەوەرە زیندووەکان لە خانەیەکی ناوی «ئەمیبا» دروست بوونە کە بەر لە ملیۆنان ساڵ لە گۆمێکدا بووە لە ئەفریقا"، ئینجا دەڵێت سروشت ئەو خانەیەی هەڵبژارد، دواتر بە چەند قۆناغی جیاوازدا پەرەی سەند تا بوو بە ماسی ئەو ماسییەش پەرەی سەند و بوو بە زۆر ماسی تر. دواتر هەندێک لەو ماسیانە -بە قۆناغی ملیۆنان ساڵ پەرەیان سەند تا بوونە گیانەوەری وشکاوی- توانییان لە ناو ئاو و وشکانیدا بژین. دواتر ملیۆنان ساڵ پەرەیان سەند تا بوونە گیانەوەری خشۆک. ئەم خشۆکانەش ملیۆنان ساڵ پێ چوو تا بوونە سێ بەش: یەکەم: شیردەر. دووەم: گیانەوەری خشۆکی هێلکەکەر. سێیەم بالندە. پاشان گیانەوەرە شیردەرەکان بە قۆناغی درێژدا تێپەڕین و بە ملیۆنان ساڵ پەرەیان سەند تا بوون بە گیانەوەرێکی هاوبەش(السلف المشترك)لەنێوان مەیموون و مرۆڤدا. دواتر بە ملیۆنان ساڵی تر پەرەیان سەند تا بوونە دوو بەش: مرۆڤ و مەیموون. دواتر مرۆڤیش پەرەی سەند تا بوو بە زۆر ڕەگەز.

(٢) هەروەها داروین دووپات دەکاتەوە کە لە پاشەڕۆژێکی نزیکدا ڕەگەزە بەرزەکان ڕەگەزە نزمەکان لەناودەبەن. ئەمەش دەقی قسەکەیەتی:

"At some future period, not very distant as measured by centuries, the civilized races of man will almost certainly exterminate & replace the savage races throughout the world."

سەرچاوەی وتەکە:

Charles Darwin (1871) The Descent of Man, 1st edition, pages 169- 168.)

هزری نوێخوازی -هەرچەندە دەڵێت کە هیچ ڕاستییەکی ڕەها بوونی نییە- باوەڕێکی ڕەها بە تیۆری پەرەسەندن (نظرية التطور) دەهێنێت،[1] ئەویش بە خوێندنی «هەڵبژاردنی سروشتی - Natural selection» ناوەڕۆکەکەشی ئەوەیە کە مانەوە بۆ باشترینەکانە، مەبەست لە باشترینیش ئەو گیانلەبەر و مرۆڤانەن کە بەهێزترن بۆ ململانێکردن لەسەر مانەوە لە ژیان. چارلس داروین (Charles Darwin) لە تیۆرییەکەیدا، لە پەڕتووکی (أصل الأنسان)دا بڵاوی کردووەتەوە و دەڵێت: "ڕەگەزی ئەفریقی زۆر پەرەی نەسەندووە و هێشتا نزیکن لە مەیموون، بەڵام ڕەگەزی ئەورووپی بەرزترین ڕەگەزە، لەبەرەوە دەبێت ڕەگەزی ئەورووپی کۆنترۆڵی جیهان بکات."[2] هەروەها داروین پێشبینی ئەوەی کرد کە توخمی ئەورووپی لە ڕەگەزی سپی و پێشکەوتوو کۆنترۆڵی جیهان دەکەن. ئەم بیرەش زۆر باش بوو ببێتە بابەتی خوێندن بۆ ئەورووپییەکان،

---

(١) چارلس داروین (Charles Darwin) دەڵێت: "هەموو بوونەوەرە زیندووەکان لە خانەیەکی بە ناوی «ئەمیبا» دروست بوونە کە بەر لە ملیۆنان ساڵ لە گۆمێکدا بووە لە ئەفریقا"، ئینجا دەڵێت: سروشت ئەو خانەیەی هەڵبژارد، دواتر بە چەند قۆناغی جیاوازدا پەرەی سەند تا بوو بە ماسی، ئەو ماسییەش پەرەی سەند و بوو بە زۆر ماسی تر. دواتر هەندێک لەو ماسیانە -بە قۆناغی ملیۆنان ساڵ پەرەیان سەند تا بوونە گیانەوەری وشکاوی- توانییان لە ناو ئاو و وشکانیدا بژین. دواتر ملیۆنان ساڵ پەرەیان سەند تا بوونە گیانەوەری خشۆک. ئەم خشۆکانەش ملیۆنان ساڵیان پێ چوو تا بوونە سێ بەش: یەکەم: شیردەر. دووەم: گیانەوەری خشۆکی هێلکەکەر. سێیەم: باڵندە. پاشان گیانەوەرە شیردەرەکان بە قۆناغی درێژدا تێپەڕین و بە ملیۆنان ساڵ پەرەیان سەند تا بوون بە گیانەوەرێکی هاوبەش(السلف المشترك)لەنێوان مەیموون و مرۆڤدا. دواتر بە ملیۆنان ساڵی تر پەرەیان سەند تا بوونە دوو بەش: مرۆڤ و مەیموون. دواتر مرۆڤیش پەرەی سەند تا بوو بە زۆر ڕەگەز.

(٢) هەروەها داروین دووپات دەکاتەوە کە لە پاشەڕۆژێکی نزیکدا ڕەگەزە بەرزەکان ڕەگەزە نزمەکان لەناودەبەن. ئەمەش دەقی قسەکەیەتی:

"At some future period, not very distant as measured by centuries, the civilized races of man will almost certainly exterminate & replace the savage races throughout the world."

سەرچاوەی وتەکە:

(Charles Darwin (1871) The Descent of Man, 1st edition, pages 169- 168.)

تا لە مێشکی منداڵەکانیاندا بچێنن کە دەبێت ڕەگەزی ئەورووپی بەسەر هەموو خەڵکییەوە دەسەڵاتدار بێت، ئەم تیۆرییەش ببێتە بیانووەک تا ماف بە ئەورووپییەکان بدات کۆنترۆڵی جیهان بکەن.

لە ئەنجامدا، ئەم فیکرەیە کاریگەری خراپی بەدوای خۆیدا هێنا و بووە هۆی ململانێیەکی هزیی توند و دژوار لەنێوان ڕەگەزپەرستاندا. هەر ڕەگەزێک دەیویست لە ململانێکەیدا ئەو سەرکەوێت و کۆنترۆڵی جیهان بکات. دەرەنجامەکەشی دروستبوونی جەنگە جیهانییەکان بوو. هەر وەک زانای بەناوبانگ «ڕیتشار ڤیکارد» (Richard Weikart) دەڵێت: "داروینیزم توانی بەها ڕەوشتییەکان لەناو ببات و ڕێگای بۆ کەسێکی وەک هیتلەر خۆش کرد تا بێت و هەوڵ بدات کۆنترۆڵی هەموو جیهان بکات."[1] واتە ریتشارد دووپاتی دەکاتەوە کە بیری داروینی هۆکارێکی سەرەکی (ناڕاستەوخۆ) بوو بۆ هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی.

ئەم بابەتە لە پەڕتووکەکەی هێتلەر (كفاحي)دا دووپات کراوەتەوە، کاتێک دەڵێت: ڕەگەزی ئەڵمانی لە هەموو ڕەگەزێکی تر بەرزترە و پێویستە سەربکەوێت و کۆنترۆڵی جیهان بکات.[2]

هەروەها بیری «میکافیل»ی بەربڵاو کاتێک دەڵێت: "الغايه تبرر الوسيله" واتە: "بۆ بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان هەموو ڕێگاکان ڕاستن"[3]؛ ئەمەش کاریگەری نەرێنی لەسەر مرۆڤایەتی دروست کرد و ڕووی مرۆڤایەتی کردە دواکەوتنی بەرژەوەندیی خۆیان و ئامانجی مرۆڤایەتیی کردە بەرژەوەندیی تایبەت. لە ڕاستیشدا ئەم بیرە بووە هۆی ململانێ و دەمارگیری و داگیرکردنی

---

(1) (From Darwin to Hitler)? Richard Weikart p:215.

(٢) پەڕتووکی: (كفاحي) هیتلەر: (١٦١ - ١٦٣).

(٣) پەڕتووکی: (الأمير) میکافیلی: (٩١).

میللەتان و دزینی ماڵ و سامانیان.

هەروەها کارل مارکسیش بە بیری داروین و مکافیل کاریگەر ببوو، بۆیە بیری «داروینیزمی کۆمەڵایەتی»ی بەرهەم هێنا[١] و ئەم بۆچوونەیشی بووە هۆی دروستبوونی جەنگە گەورەکان کە شوێنکەوتووانی مارکس پێی هەستان. بە جۆرێک، تا یەکێتی سۆڤیەتیان دامەزراند، دەیان ملیۆن کەس کوژران.

## سەفسەتە لە هزری «پاش نوێخوازی»دا (ما بعد الحداثه - Postmodernism)

زۆر لە بیرمەند و لێکۆڵەران ڕەخنەیان لە فیکری نوێخوازی هەبووە، چونکە زۆر هەڵەی تێدا هەبووە. بۆیە هەوڵیان دا فیکرێکی تر بهێننە کایەوە، ئەویش فیکری «دوای نوێخوازی» (ما بعد الحداثة - Postmodernism) بوو.

ئەم فیکرەش جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ فیکری یەکەم هەبوو.

- فیکری نوێخوازی ساخکردنەوەی سەفسەتەی عیندی (بە لای منەوە) بوو، چونکە دەیگوت: ڕاستییە مەعریفییەکان تەنیا لە عەقڵی مرۆڤدا هەن و لە واقیعدا نین. بەڵام فیکری «دوای نوێخوازی» ساخکەرەوەی سەفسەتەی عینادییە، چونکە دەڵێت: هیچ ڕاستییەکی مەعریفی بوونی نییە، نە لە عەقڵ و نە لە واقیعدا.

- لە فیکری نوێخوازیدا مرۆڤ سەنتەری بوون و سەرچاوەی مەعریفە بوو. بەڵام لە فیکری پاش نوێخوازیدا مرۆڤ شتێکی بێبەهایە و سەرچاوەی مەعریفەش نییە.

- لە فیکری نوێخوازیدا مرۆڤ سەرچاوە و بەهای ڕەوشتییە (القیم الأخلاقیة).

---

(١) پەرتووکی: (رأس المال)، مارکس: (٥٨ - ٥٩).

واتا ئەو فیکرەیە مرۆڤی گەیاندە پلەیەکی بەرز و پیرۆز. بەڵام فیکری «پاش نوێخوازی» مرۆڤی کردە شتێکی سادە، وەک هەموو شتێکی بێرۆح.

هەر وەک (ستیڤن هاوکینگ _ Stephen Hawking) لە پەرتووکەکەی خۆیدا (The Grand Design) مرۆڤ وەک کەرەستەیەکی ماددی وەسف دەکات. هەروەها لە دیدارێکیدا دەڵێت: "مرۆڤ تەنیا چڵکێکی کیمیاییە لەسەر هەسارەیەکی بچووک."[1]

هەندێک لە لێکۆڵەرانیش دەڵێن: فیکری نوێخوازی وەک کەرەستە و ئالەتێکی وشک و ڕەق بوو، بەڵام فیکری دوای نوێخوازی وەک کەرەستە و ئالەتێکی نەرم و ڕوونە. بەم جۆرە، ڕەخنەی زۆر لە فیکری نوێخوازی گیرا، پاشان ئەو ڕەخنانە بوونە هۆی پەیدابوونی فیکری پاش نوێخوازی.

دواتر زۆر هزر و فیکری تر دەرکەوتن، وەک فیکری نەبوونگەرایی (العدمی - Nihilism) و فیکری بێبەهایی (العبثیة - Absurdity) و فیکری هەڵوەشاندنەوە (التفکیکیە - Deconstruction) ... هتد. ئەم فیکرانە هەموویان کەوتنە ژێر فیکری «دوای نوێخوازی».

ئاشکرایە کە لە فیکری دوای نوێخوازیدا پێناسەی مرۆڤ گۆڕدرا، ئەوان دەڵێن: "مرۆڤ نە سەنتەری بوونە، نە سەرچاوەی مەعریفەیە و نە سەرچاوەی بەهای ڕەوشتیشە -القیم الأخلاقیە-"

بەم جۆرە، مرۆڤیان لە پلەیەکی بەرز هێنایە خوارەوە بۆ ئاستی شتی بێگیان. واتە مرۆڤیان کرد بە شت و هیچ مانایەکیان بۆ بوونی مرۆڤ نەهێشتەوە و هیچ جیاوازییەکیان لەنێوان مرۆڤ و هەر شتێکی تر نەهێشت.

ئەگەر سەیر بکەینە فیکری «دوای نوێخوازی»، دەبینین کە هیچ بەهایەک

---

(1) STEPHEN HAWKING, From an interview with Ken Campbell in the 1995.

بۆ مرۆڤ نەهێڵراوەتەوە و کراوە بە شتێکی بێبەها. وەک فرۆید (Sigmund Freud) کە نەفسی مرۆڤ دەکاتە نەفسێکی گیانەوەری، وەک دەڵێت: "نەفسی مرۆڤ نەفسێکی گیانەوەرییە، ئامانجی سەرەکیی نەفسی مرۆڤ تەنیا سێکس و جووتبوونە."[1] مەبەستیشی ئەوەیە کە هیچ جیاوازییەک لەنێوان مرۆڤ و گیانداردا نییە. هەروەها لە پەرتووکەکەی خۆیدا (الطوطم والحرام)دا باسی گرێی ئۆدیب (عقدة أوديب) دەکات، مەبەست پێی ئەو گرێیەیە کە دەبێتە ڕێگرلەبەردەم کردنی کاری سێکسی لەنێوان دایک و کوڕدا. هەروەها باسی گرێی ئەلێکترا (عقدة أليكترا)یش دەکات و مەبەست پێی ئەو گرێیە کە دەبێتە ڕێگر لەبەردەم کردنی کاری سێکسی لەنێوان باوک و کچدا. فرۆید دەڵێت: ئەوە کارێکی ڕاستە، چونکە مرۆڤ ناچارە حەزی سێکسیی خۆی تێر بکات و نابێت ڕێی لێ بگیرێت![2]

هەروەها لە فیکری مارکسیدا (Karl Marx) مرۆڤ تەنیا بەرهەمی سروشتە و بەشێکە لە سروشت، واتا بوونێکی ماددییە، دەبێت و دەمرێت، وەک گیایەک دەڕوێت و دەپووکێتەوە. ئامانجی مرۆڤ تەنیا «نیشتەجێبوون و خواردن و حەزی سێکسییە» بەم جۆرە مرۆڤی لە پلەی مرۆڤبوون خست و هێنایە پلەی گیانەوەران. هەروەها دەڵێت: "هیچ ڕاستییەک بۆ بەها ڕەوشتییەکان نییە، ئەو بەهایانە هەمووی فێڵبازیی دیندارانە تا خەڵکی پێ بخەڵەتێنن."[3]

زۆرێکیش لە زانا مولحیدەکانی سەردەم -بەپێی فیکرەی دوای نوێخوازی- ئەوە دووپات دەکەنەوە کە هیچ مانایەک بۆ بوونی مرۆڤ نییە، مرۆڤ تەنیا شتێکە وەک شتە بێرۆحەکانی تر و هیچ بەهایەکی تایبەتیی نییە،

---

(١) (حياتي والتحليل النفسي) سجيموند فرويد: (٥٧)، و (الطوطم والحرام) سجيموند فرويد: (١٣١).

(٢) (الطوطم والحرام) سجيموند فرويد: (١٣١ - ١٣٢).

(٣) (مفهوم الإنسان عند ماركس)، ايريك فروم: (٤٣ - ٤٥).

چونکە مرۆڤ و گیانەوەر و مێشومەگەز، هەموویان بەرهەمی سروشتن و هیچ جیاوازییەکی مەعنەوی لەنێوانیاندا نییە.

نموونە لەسەر ئەم بۆچوونە:

- «لورانس کراوس» (Lawrence Krauss)، زانای مولحیدی سەردەم لە دیدارێکی تەلەفزیۆنیدا پرسیاری لێ کرا: "مادام تۆ دەڵێیت هیچ ڕاستی و بەهایەکی ڕەوشتی بوونی نییە، ئایا چی دەڵێیت لەبارەی زیناکردن لەگەڵ مەحرەمەکان (دایک و خوشک و کچ)؟" لە وەڵامدا وتی: "ناتوانم بڵێم کە زینا لەگەڵ مەحرەمەکاندا شتێکی هەڵەیە، چونکە مرۆڤ هیچ بەهایەکی تایبەتی نییە، بەڵکوو تەنیا کەرستەیەکی ماددییە."[١]

- زانای ئیگلیز و مولحیدی بەناودەنگ، «ڕیچارد داوکینز» (Richard. Dawkins)یش لە دیدارێکی تێلەفزیۆنیدا دەڵێت: "ناتوانم بڵێم هاوڕەگەزبازی کارێکی ناشرینە، چونکە مرۆڤ تەنیا شتێکی ماددییە"[٢]

- هەروەها بیرمەند و مێژوونووسی ئەمریکی، «فرانسیس فوکویاما» (Francis Fukuyama) لە پەرتووکەکەیدا (نهایە التاریخ)دا دەڵێت: "کێشەیەکی گەورە لە فیکری سێکیولاریزمدا هەیە، ئەویش ئەوەیە کە مادام مرۆڤ لە سروشتەوە دروست بووە و میکرۆب و گیانەوەریش هەر لە سروشتەوە پەیدا بوونە، ئایا بۆچی کوشتنی هەزارەها یان ملیۆنان میکرۆب کارێکی دروستە و کوشتنی مرۆڤ کارێکی هەڵەیە؟" واتە لە فیکری ماددیگەری و ئیلحاددا کوشتنی مرۆڤ شتێکی هەڵە نییە و هیچ بەهایەکی ڕەوشتیی ڕەها نییە ڕێگری لە کوشتنی مرۆڤ بکات.

---

(١) ئەم قسەیە لە دیبەیتێکی بەریڵاودا وترا کە لەنێوان لۆرانس کراوس و بانگخواز حەمزە تزورتیس ئەنجام درا:

https://youtu.be/Zp7dRpWIdBo

(٢) سەرچاوە: https://youtu.be/OZZ3k-lU6Q8

لەبەرئەوە لە فیکری دوای نوێخوازیدا لەباربردنی منداڵ لە زگی دایکیدا (الإجهاض) کارێکی ڕێپێدراوە. هەرچەندە لە فیکری نوێخوازیدا کۆمەڵێک ڕێگری هەبوون، بەڵام لە فیکری دوای نوێخوازیدا ڕێی پێ درا. هەر لەبەر ئەوەشە کە چەند ئامار و سەرژمێریی ورددا پیشانی دەدەن، هەر وەک لە پەرتووکی (أرقام تحاكي العالم)دا هاتووە کە لە ساڵێکدا ملیۆنان حاڵەتی لەباربردنی منداڵ ڕوودەدەن.[1] بۆچی کارێکی هەڵە نییە؟ چونکە ئەو منداڵە لەباربراوە تەنیا شتێکی ماددی بوو و فڕێدرا.

## کاریگەریی فیکری نوێخوازی لەسەر موسڵمانان

وەک ئاماژەمان پێ دا، فیکری «نوێخوازی» بەرهەمی «سەفسەتەی عیندی»یە و فیکری «دوای نوێخوازی»یش بەتەواوی بەرهەمی «سەفسەتەی عینادی»یە، نە هیچ ڕاستییەکی بابەتی هەیە و نە هیچ ڕاستییەکیش لە هزری مرۆڤدا هەیە، مرۆڤ تەنیا شتێکە و هیچ مانایەکی تر بۆ مرۆڤ نییە.

ئەوەیشی زیاتر لە هەموو شتێک کاریگەری لەسەر موسڵمانان هەبووە و لادانی (تحريف) لە فیکری ئیسلامیدا کرد، ئەوەبوو کاتێک هەندێک نووسەر لە جیهانی ئیسلامیدا بە فیکری نوێخوازی (الحداثة) و دوای نوێخوازی (ما بعد الحداثة) کاریگەر بوون و هەوڵیان دا لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا جێبەجێی بکەن.

لەو فیکر و بیرانەشی کە ئەم نووسەرانە پێی کاریگەر بوون، تیۆری

---

(١) پەرتووکی: (أرقام تحاكي العالم). عمر توفيق: (٨٨). و پەرتووکی: (موت الغرب) باتريك جي: (٣٢ - ٣٣).

«مردنی نووسەر» بوو، تیۆرییەکە لەسەر دەستی نووسەری فەڕەنسی «ڕۆلان بارت» لە ساڵی ١٩٦٧ دەرکەوت. ئەم تیۆرەی لەسەر دەق ئەدەبی بەکاردەهێنا، ناوەڕۆکی تیۆرییەکە دەڵێت: "دەق (النص) کاتێک لە لای نووسەر دەردەچێت، ئیتر ئەو دەقەکە هیچ پەیوەندییەکی بە نووسەرەوە نامێنێت و دەبێتە موڵکی خوێنەر. خوێنەریش مافی خۆیەتی هەرچۆنێک تێبگات، بەپێی پرەنسیپەکانی خۆی. واتە هیچ بیر لە مەبەستی نووسەر ناکرێتەوە، وەک ئەوەی «نووسەر مردبێت». واتە نووسەر هیچ پەیوەندییەکی بە پەڕتووکەکەیەوە نییە و مافی هەر خوێنەرێکە وەک خۆی تێبگات و وەک خۆی شرۆڤە بکات. هەروەها پشتی بە چەند بنەمایەک بەست بۆ تێگەیشتن لە دەق، بەڵام گرنگترین بنەمای لادا کە ئەویش مەبەستی نووسەرە."

ئەوان دەق (النص) و مانایان لە یەکتر جیاکردەوە، واتە پێویست و گرنگ نییە ئەم وشەیە ئەو واتایەی هەبێت و مرۆڤ ئازادە لەوەی چۆن تێبگات.

بەم جۆرە هەر خوێنەرێک واتایەکی تایبەت بە دەق دەدات. بەمەش دەقێک دەبێتە خاوەنی مانای جودا جودا و دەکرێت زۆر لەو مانایانەش دژ بن.

بەڵام هەندێک نووسەری سێکیولاریزم لە جیهانی ئیسلامیدا کاریگەر بوون و هەوڵیان دا ئەم تیۆرییە لەسەر ئایەتەکانی قورئان جێبەجێ بکەن، بۆیە وتیان هیچ پەیوەندیێکیان بە مەبەستی خواوە نییە و هەوڵ دەدەن وەک خۆیان لە قورئان تێبگەن و شیکاری بکەن. بۆیە زۆر تەفسیر و ڕاڤەکردنی هەڵەیان دایە قورئان، هەروەک موحەممەد شەحرووری نووسەر دەڵێت: باڵاپۆشی شتێکی پێویست نییە، حەجکردن فەرز نییە، ڕۆژووگرتن فەرز نییە، مەی خواردنەوە حەرام نییە، ئەنجامدانی سێکس لەنێوان هاوڕێ کچ و کوڕەکاندا ئاساییە و ڕاستە.

بەڵام بەپێی زانستی زمان و بنەما ڕێزمانییەکان و ڕەوانبێژی، کاتێک

دەتەوێت دەقێک بخوێنیتەوە، مەبەستی نووسەر گرنگترین شتە تێی بگەیت (چ دەقێکی پیرۆز بێت یان مێژوویی بێت)، ئەوکات دەبێت بزانیت کێ ئەم شتەی وتووە؟ لە کوێ وتوویەتی؟ بۆ کێ وتوویەتی؟ لە چ کاتێکدا وتوویەتی؟ بە چ بۆنەیەکەوە وتوویەتی و لە چ سیاقێکدا وتوویەتی؟

واتە بۆئەوەی بزانیت مەبەستی نووسینەکە چی بووە، پێویستە هەموو ئەو شتانە بزانیت. ئامانج لە تیۆری ڕێکخستن (نظرية النضم) ئەوەیە بگەیتە مەبەستی نووسەر.

لەبەر ئەمەش دەبینیت لە کۆمەڵەی سوننیدا دەڵێت کە شوێنکەوتنی قورئان و سوننەت، شوێنکەوتنی قورئانە بە تێگەیشتنی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) چونکە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) لە هەموویان باشتر لە مەبەستی خوا تێدەگات، پاشان تێگەیشتنی هاوەڵان، هەرچەندە ئەوانیش لە بەهەڵەداچوون پارێزراو (مەعصوم) نەبوونە، بەڵام چونکە لە هەموویان نزیکتر بوون بۆ تێگەیشتن لە مەبەستی خوا لە قورئاندا و پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) لە فەرموودەدا.

بەڵام ئەو موسڵمانانەی بە فیکری «دوای نوێخوازی» کاریگەر بوون، بە تیۆریی «مردنی نووسەر»یش کاریگەر بوون، ئەوەی کە دەڵێت: "ئێمە هیچ پەیوەندییەکمان بە مەبەستی قسەکەر یان دانەرەوە نییە، بەڵکوو تەنیا پەیوەندیمان بە تێگەیشتنی خۆمانەوەیە کە چۆن لێی تێدەگەین." ئینجا واتای تیۆریی «مردنی نووسەر» وەک نیشانمان دا، ئەوەیە کە دانەر و نووسەر مردوون و دەق موڵکی ئەو نییە، بەڵکوو موڵکی خوێنەرە و هەر کەسێک مافی خۆیەتی چۆن لێی تێدەگات.

## کۆمەڵێک لە نوێخوازە عەرەبەکانی سەردەم

ژمارەیەکی زۆری نووسران لە جیهانی ئیسلامیدا کاریگەر بوون بە «فیکری نوێخوازی و فیکری دوای نوێخوازی»، ئەم فیکرەیان بڵاو دەکردەوە و لە کتێبەکانی خۆیاندا بەکاریان دەهێنا، لەوانەش: نەصر حامد ئەبوو زەید، فەرەج فودە، موحەممەد ئارگون، موحەممەد شەحروور، ئەحمەد عەبدە ماهر، ئەحمەد قبانجی و زۆری تر.

نەسر حامد ئەبوو زەید دەڵێت: "ئێمە دەبێت قورئان بە خوێندنەوەیەکی ناسووتی (مرۆڤایەتی) بخوێنینەوە، نەک خوێندنەوەیەکی لاهووتی (خودایی)." مەبەستی ئەوەیە کە قورئان شتێکی مرۆڤایەتییە و پێویستە بە پێوەری ڕەخنەی مرۆڤایەتی بخوێندرێتەوە، نەوەک شتێکی پیرۆز بێت و لەسەرووی ڕەخنە و بۆچوونی ئێمەوە بێت.[١]

ئینجا ئەم هەڵانەی زمانی و ڕەوانبێژی و هزری لە بیری نوێخوازیدا ڕوویدان و کاریگەری لەسەر هەندێک نووسەری سێکیولاریزم لە کۆمەڵگای ئیسلامیشدا دروست کرد، هەتا هەندێکیان دەڵێن: " بەڵگەکانی هەبوونی خودا، بەڵگەی دڵنیاکەر نین."[٢]

ئەمە لە کاتێکدا بەڵگەکانی هەبوونی خودا، بەڵگەی دڵنیا و حاشاهەڵنەگرن لای فەیلەسووفەکانی قوتابخانەی عەقڵی و زانا کەلامناسەکان و زانایانی ثیۆلۆژیا (لاهووتناسی) و لای هەموو ئایینەکانیش بەڵگەی دڵنیان و شەکیان تێدا نییە. جا ئەگەر بەڵگەکانی هەبوونی خودا دڵنیاکەرەوە نەبن لای ئەو سێکیولاریزمانە، مانای وایە کە ئەو بەڵگانە شەکدار و گوماناوین.

---

(١) پەڕتووکی: دراسة النظريات ونقدها، نصر حامد ابو زيد: (٢٣٣ – ٢٣٨). و پەڕتووکی: الخطاب الديني رؤية نقدية ، نصر حامد ابو زيد: ٥٨.

(٢) ڕاپۆرتی: الإله الخالق فرضية ظنية وليس بالحقيقة اليقينية، فادي كمال صباح: الحوار المتمدن-العدد: ٤٢٢٣ - ٢٠١٣ / ٩ / ٢٢ - ١٨:٤٠

هەروەک ئەوان دەڵێن: هەبوونی خوا شتێکی یەقینی نییە و شەکە، دەکرێت خودا هەبێت و دەکرێت نەبێت.[1] لیرەدا ئەوان دەرفەت بۆ مولحیدەکان خۆش دەکەن تا وا بزانن کە ڕێبازی ئەوانیش ڕاستە و هەڵە نین. چونکە لە فیکری نوێخوازیدا هیچ ڕاستییەکی ڕەها نییە، بەڵکوو هەموو شتێک دەکەوێتە ژێر شەکەوە. واتە هەر بۆچوونێک دەکرێت ڕاست بێت و دەشکرێت هەڵە بێت. ڕوونیشە کە وەها بۆچوونێک لە زانستی لۆژیکدا هەڵەیەکی هزری گەورەیە. چونکە هەبوونی خودا شتێکی خوازسک و فیترییە لە ناخی مرۆڤدا و بەڵگەی عەقڵی و لۆژیکی و زانستیی یەکلاکەرەوە لەسەر هەبوونی خودا هەن.[2]

ئەگەر لە لایەکی ترەوە بڕوانینە هزری ئەو موسڵمانانە کە بە نوێخوازی کاریگەربوونە، دەبینین ئەو کەسانە گرنگی بە تێگەیشتنی پێغەمبەر (دروودی خووی لەسەربێت) نادەن و پشتی لێ دەکەن. بە هەمان شێوە گرنگی بە تێگەیشتنی هاوەڵان و زانا و ڕاڤەکەران نادەن، تەنیا خۆیان بەتەمای تێگەیشتنی خۆیان دەهێڵنەوە و تەنانەت تێگەیشتنی خۆیان لە هەموو پێوەرەکان بەرزتر دادەنێن، جا پێوەری زمانی، یان ڕەوانبێژی، یان عەقڵی بن. ئەو کەسە لە تێگەیشتنی خۆیشیدا ئەم پێوەرانە دەداتە لایەک.

## فیکری نوێخوازی لای موحەممەد شەحروور

با بۆچوونی نووسەرێکی بەناوبانگ لەسەر ئەم بابەتە بێنینەوە کە د. موحەممەد شەحروورە. ئەم نووسەرە هەموو بنەماکانی تەفسیر و (أصول الفقة) و زمان و ڕەوانبێژی ڕەت دەکاتەوە و پشت دەبەستێت بە تیۆری «مردنی نووسەر». شەحروور ئەم تیۆرییەی لەسەر قورئان بەکارهێنا، بۆیە هەموو بنەما

---

(١) پەڕتووکی: العالمانية طاعون العصر، د. سامي العامري: ١٦٩

(٢) بۆ زانیاریی زیاتر؛ بگەڕێوە پەڕتووکەکەمان، بە ناوی: (ئیلحاد)، لاپەڕە: (٢٩) تا (٦٥)

پێویستەکانی بۆ گەیشتن بە مەبەستی خودا ڕەت دەکردەوە و ئەو مافەی بە خۆی دا کە وەک خۆی لە قورئان تێبگات و بە ئارەزووی خۆی تەفسیری بکات. بەم جۆرە واتای هەموو ئەحکامەکانی قورئانی تەحریف کردن (بە هەڵە لێکدانەوەی بۆ کرد) مانا درووستەکانیانی لادا و بەپێی تێگەیشتنی خۆی تەفسیری کردن. دواتر هەندێک لە تەحریفەکانی بۆ ئایەت و ئەحکامەکانی قورئان دەخەینە بەرچاو، لە کۆتاییشدا کۆمەڵێک سەرچاوە لەبارەی هزر و بیروڕای شەحروور بۆتان دەخەینە ڕوو تا بتوانن سوودی لێ وەربگرن.

### هەندێک لە هەڵە و تحریفەکانی شەحروور:

- دەڵێت: (مساكنة) لەنێوان کچ و کوڕدا دروستە و حەرام نییە. موساکەنەش ئەوەیە کچ و کوڕەکە پێکەوە بژین و لەلای یەکتر بخەون، تەنانەت بۆیان حەڵاڵە کاری سێکسیش ئەنجام بدەن، بەڵام بە مەرجی ڕازیبوونی هەردوو لا.

- ئەو دەڵێت: زینا تەنیا بەم جۆرانە حەرامە: زیناکردن بەشێوەی کۆمەڵ (جەماعی)، زینا لەگەڵ مەحرەم، زینا لەگەڵ باوەژن. زینا لەگەڵ ئافرەتی هاوسەردار، زینای هاوڕەگەزبازی.

- دەڵێت: ڕۆژووگرتن لەسەر مرۆڤی موسلمان ئەرک (واجب) نییە، دەتوانێت ڕۆژوو بخوات، بەڵام کەفارەتی بۆ بدات. واتە خواردن بداتە هەژارێک.

- دەڵێت: مەیخواردنەوە حەرام نییە، تەنیا پێویستە مرۆڤ خۆی لێ دووربخاتەوە، واتە ئەگەر کەمێک بخواتەوە، دروستە.

- دەڵێت: باڵاپۆشی (حیجاب) لەسەر ئافرەتی موسلمان ئەرک (واجب) نییە و دروستە قژ و دەست و مل و پێیەکانی دەربخات.

- دەڵێت: هەموو ئایینەکان ڕاستن، هەر کەسێک لەدوای ئایینی خۆی بڕوات، دەچێتە بەهەشت.

- دەڵێت: پایەکان (ئەرکانەکان)ی ئیسلام و پایەکانی ئیمان هەموو درۆن و هیچ ڕاستییەکیان بۆ نییە.

- دەڵێت: ئەو ڕیبایەی لە بانکەکان دەکرێت، دروست و حەڵاڵە.

- دەڵێت: ئەو ئەحکامانەی لە قورئاندا هاتوون لەبارەی: خێزان، پەروەردەی منداڵ، ژن مارەکردن و تەلاقدان، میرات و کاری ئابووری، کۆمەڵێک پرسی درۆن و بەکەڵکی ئەم سەردەمە ناهێن.

ئەمانە هەندێک لە هەڵە هزرییەکانی شەحروور بوون.

تێبینی: زۆر پەڕتووک لەبارەی ڕەتدانەوەی فیکرەکانی شەحروور و هەڵەکانی نووسراون.[1]

---

(١) هەندێک لە پەڕتووکەکان:
الحداثيون العرب في العقود الثلاثة الأخيرة والقرآن الكريم - دراسة نقدية - ٢٠٠٦.
قراءة معاصرة في القراءة المعاصرة - د. صهيب محمود السقار - ٢٠٢٠.
القراءة المعاصرة للدكتور شحرور - مجرد تنجيم/ كذب المنجمون ولو صدقوا - سليم الجابي.
القراءة المعاصرة للقرآن في الميزان - أحمد عمران - ١٩٩٥.
تهافت القراءة المعاصرة - د. منير الشواف - ١٩٩٣.
بيضة الديك - نقد لغوي لكتاب (الكتاب والقرآن).
القرآن وأوهام القرآة المعاصرة - م. جواد عفانة - ١٩٩٤.
الماركسية والقرآن - قراءة في دعاوي معاصرة - محمد صياح المعراوي. شحرور مفسرا بعد التعديل - فوزي بن عبد الصمد فطامي.
نقض منهجية القراءة المعاصرة للنص القرآني عند محمد شحرور - عباس شريفة.
الاشكالية المعاصرة في الكتاب والقرآن - ماهر المنجد.
بؤس التلفيق - نقد الاسس التي قام عليها طرح شحرور- يوسف سمرين.
التحريف المعاصر في الدين - مكيدة الماركسية والباطنية المعاصرة - حسن حبنكة الميداني.
بيت العنكبوت - ظاهرة الشحرورية وأخواتها. د. محمد بن ابراهين السعيدي و د. علي بن محمد العمراني.

## فیکری «نوێخوازی» لە پەڕتووکی (نظریە اذان الأنعام)دا:

نووسەر عیماد بابەکریش -خاوەنی پەڕتووکی: (نضریە اذان الأنعام)- باوەڕی بە تیۆریی «مردنی نووسەر» هەیە و لسەر قورئان جێبەجێ دەکات.

ئەو دەڵێت: ئەو فەرموودانەی باسی ئادەم (سڵاوی خوای لێ بێت) دەکەن و ئەو هاوەڵ و زانا و موفەسیر و مێژوونووسانەشی باسی ئادەم دەکەن، هەموویان هەڵەن، چونکە دەڵێن ئادەم کەسێکی تەنیا بووە، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە "ئادەم کەسێکی تەنیا نەبووە، ئادەم هۆزێک بوو و ٣٢ ئادەم هەبوون."

ئێمە پێی دەڵێین: قورئان بە ئاشکرایی ئەوە دووپات دەکاتەوە کە ئادەم کەسێکی تەنیا بوو، ئەمەش لە زۆر ئایەتدا هاتووە لەوانەش: ﴿ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً ﴾[1]، واتە: «جێنشینێک (یەکە، ئەویش ئادەمە) لە ئەرزدا جێنشین دەکەم.»

هەروەها لە ئایەتێکی دیدا دەفەرمووێت: ﴿اسْكُنْ أَنْتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ﴾[2]، دەفەرمووێت: «(یا آدم) و ئەو یەکە، (اسکن) بۆ کەسێکە، (أنت) بۆ یەکێکە، (زوجک) بۆ کەسێکە.» واتە قورئان ئاشکرا دەکات کە ئادەم کەسێکی تەنیایە و پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) و هەموو هاوەڵانیش وا تێگەیشتوون کە ئادەم یەک کەسە و تەنیایە. هەموو زانایانی زمان و تەفسیریش هەر وا تێگەیشتوونە، بەڵام خاوەنی پەڕتووکی (نظریە اذان الأنعام) دەڵێت: "ئەوەی من تێدەگەم ئادەم یەک کەس نییە، بەڵکوو هۆزێکە، کۆمەڵێک مرۆڤن و ئادەم ٣٢ کەسن." واتە لای ئەو پێوەرەکانی زمان و ڕێزمانی عەرەبی و بنەماکانی تەفسیر هەڵەن. تێگەیشتنی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) هاوەڵان و هەموو موفەسیرانیش هەڵەیە و تەنیا تێگەیشتنی ئەو ڕاستە.

---

(١) سورة البقرة: (٣٠)

(٢) سورة البقرة: (٣٥)

ئا ئەمە سەفسەتەیە، ئەمە شکاندنی هەموو پێوەرەکانی زمان و ڕێزمان و ڕەوانبێژییە ... هتد.

هەر ئەم کەسە لە پەڕتووکەکەیدا دەڵێت: "مانای (الشجرة) لەم ئایەتەدا ﴿وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾[1] دار نییە، بەڵکوو مەبەست لێی زیناکردن، واتە: خۆتان نزیکی زینا مەکەن!"

هەروەها دەڵێت: "کەشتییەکەی نووح کەشتی نەبوو، بەڵکوو مەبەست پێی هەڵبژاردنی سروشتی (الإنتخاب الطبيعي) بوو" دەشڵێت: "بۆچی نووح کوڕەکەی خۆی سوار نەکرد؟ چونکە پەککەوتە بوو. تیۆری (الإنتخاب الطبيعي) مرۆڤی پەککەوتە وەرناگرێت، بەڵکوو تەنیا مرۆڤی دروست هەڵدەگرێت." ئەریّ باشە بە چ بەڵگەیەک پەککەوتە بووە؟ ئەگەر پەککەوتە بووبێت، چۆن بە باوکی وتووە کە بەسەر چیا دەکەوێت؟! هەر وەک قورئان دەفەرموورێت:

﴿وَهِيَ تَجْرِي بِهِمْ فِي مَوْجٍ كَالْجِبَالِ وَنَادَىٰ نُوحٌ ابْنَهُ وَكَانَ فِي مَعْزِلٍ يَا بُنَيَّ ارْكَبْ مَعَنَا وَلَا تَكُنْ مَعَ الْكَافِرِينَ ﴿٤٢﴾ قَالَ سَآوِي إِلَىٰ جَبَلٍ يَعْصِمُنِي مِنَ الْمَاءِ﴾[2]

ئەم ئایەتە زۆر بەئاشکرایی دوویات لەوە دەکاتەوە کە نووح (سڵاوی خوای لیّ بێت) بە کوڕەکەی وتووە کە لەگەڵ ئەودا بچێت و لەگەڵ کافرەکاندا نەمێنێتەوە، بەڵام ئەو پێی وت کە دەچێتە سەر چیاکان و ڕزگاری دەبێت، پاشان ئایەتەکە نیشانی دا کە لە ئاودا خنکا.

ئەم وشە ڕوون و ئاشکرایانە و ئەو مانا دیارەی بەشی ئەوەن کە مرۆڤ بزانێت ئەم کەسانە یاری بە عەقڵی خەڵکی دەکەن و سەفسەتە (بەهەڵەدابردن)

---

(١) سورة البقرة: (٣٥).

(٢) سورة هود: (٤٢ - ٤٣).

دەکەن، تا بتوانن مانای ئایەتەکانی قورئان تەحریف بکەن.

بەڕاستی ئەم پەڕتووکەی بە ناوی: (نظریە اذان الأنعام) ئەوەندە بێمانایە پێویست ناکات مرۆڤ بیخوێنێتەوە و وەڵامی بداتەوە، بەڵام بۆیە باسمان کرد تا هەڵە زەقە بێسەروبەرەکانی پیشان بدەین.

بەم جۆرە بۆمان دەرکەوت کە ئەو سەفسەتەیەی بە ناوی «عیندی» و «عینادی» ئێستاش بە ناوی نوێخوازییەوە(الحداثە - Modernity) و پاش نوێخازی (ما بعد الحداثە - Postmodernism) بەردەوامە.

# بەشی سێیەم

# مەحاڵە عەقلییەکان (المحالات العقلية)

مەحاڵی عەقڵی: واتە، بەپێی بنەما عەقڵییەکان، دروستبوونی شتێک مەحاڵ بێت.

مەحاڵە عەقڵییەکانیش زۆر لە هەڵە لۆژیکییەکان (مغالطة) گەورەترن، چونکە دەکرێت هەڵەی لۆژیکی دروست ببن، بەڵام مەحاڵی عەقڵی دروست نەبوونە و هیچ کاتێکیش دروست نابن.

پێناسەی مەحاڵی عەقڵی (المحال العقلي): ئەو شتەیە کە عەقڵ دەزانێت پەیدابوونی مەحاڵە، واتە دروست نەبووە و هیچ کاتێکیش دروست نابێت.

## جۆرەکانی مەحاڵ:

**١- مەحاڵی عەقلی:** لێرەداعەقڵ حوکم دەدات کە دروستبوونی ئەو شتە مەحاڵە (دروست نەبووە، نە ئێستا و نە پاشەڕۆژیش دروست نابێت). بۆ نموونە: دوو شتی دژیەک لە یەک کاتدا ڕوونادەن. وەک ئەوەی بڵێین: "فلان مردووە و نەمردووە."

نموونەیەکی تر لە مەحاڵە عەقڵییەکان ئەوەیە کە ڕوودان پێش هۆکار هەبێت، وەک ئەوەی مرۆڤ پێش باوکی هەبێت، یان وەک ئەوەی خوا لە قورئاندا دەفەرمووێت: ﴿لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا ۚ فَسُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ

الْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٢٢﴾[1]، ئەو کەسەی باوەڕی بە خوا هەیە، پێویستە باوەڕی بە تەواوی هێز و دەسەڵات و ویست و دادپەروەریی ئەویشی هەبێت. جا بەم شێوەیە مەحاڵە عەقڵ باوەڕی بەوە هەبێت کە دوو خوا هەبن. یەکێکیان بڕیار بدات فلان کەس بمرێت و ئەوەی تر بڕیاربدات نەمرێت. ئەگەر وا بێت، ئەوا سێ گریمانەمان دەبێت:

گریمانەی یەکەم: بڕیاری هەردووکیان بەجێبێت، بەڵام ئەوە مەحاڵە؛ چونکە نابێت ئەو کەسە لە هەمان کاتدا مردوو و زیندووش بێت، چونکە بەگوێرەی بنەما عەقڵییەکان نابێت دوو شتی دژیەک لە هەمان کاتدا هەبن.

گریمانەی دووەم: بڕیاری هیچ لە خوایەکان نێتە جێ، واتە هەردووکیان بێهێز و بێویست بن، تواناکان تەواو نەبێت. ئەگەر توانایان تەواو نەبێت، ئەوکات هیچ مانایەک بۆ خوایەتییان نامێنێت. بەم جۆرە دەردەکەوێت کە هیچ کامیان خودا نین.

گریمانەی سێیەم: ویستی یەکێکیان بێتە دی و هی ئەوەی تریان نا. ئەوەی ویستەکەی بێتە دی، خودایە. ئەوەیشی ویستەکەی نێتە دی، خودا نییە.

لەبەرەوە ناکرێت دوو خودا هەبن، چونکە هێز و توانا و ویستی خودا ڕەهایە و بێسنوورە.

٢- مەحاڵی عورفی: ئەو ڕووداوەیە کە عەقڵ قبووڵی بکات و مەحاڵ نەبێت، بەڵام لە عورفێکی تایبەتدا مەحاڵ بێت.

ئەگەر ڕێژەی هەبوونی شتێک (٠.١٪)یش بێت، ئەوە لای عەقڵ شتێکی مەحاڵ نییە، بەڵام دەکرێت لە عورفی شوێنێکدا مەحاڵ بێت. بۆ نموونە، ئەگەر پێت بڵێم کە هەڵبژاردەی عێراق کاسی جیهانی دەباتەوە، بەڵام تۆ بڵێیت:

---

(١) سورة (الأنبياء): ٢٢.

"نەخێر، ئەوە مەحاڵە و هیچ کات ڕوو نادات." ئەوا ئەمە لە عورفدا مەحاڵە، چونکە لە عورفدا و لەم کاتەدا عێراق توانای ئەوەی نییە لە بەرانبەر هەڵبژاردە جیهانییەکان بوەستێتەوە. ئەمەش لەبەر هەبوونی هەڵبژاردەی زۆر بەهێزتر لە عێراق. بەڵام لە عەقڵدا دەکرێت عێراق لە پاشەڕۆژدا کاسی جیهانی بباتەوە، ئەگەر تەنانەت ئەگەری ڕوودانی ١٪ یان ٢٪ش بێت.

نموونەیەکی تر: ئێستا لە عورفدا مەحاڵە گەندەڵی لە عێراق و کوردستان نەمێنێت، بەڵام مەحاڵێکی عورفییە، چونکە لە عەقڵدا دەکرێت ڕۆژێک بێت و حوکوومەتێکی دادپەروەر دروست ببێت.

## جۆرەکانی مەحاڵی عەقڵی:

### ١- مەحاڵی ڕیزبەندی (إستحالة التسلسل)

ماناکەی ئەوەیە: ڕووداوێک پێویستی بە هۆکارێک هەبێت، ئەو هۆکارەش پێویستی بە هۆکارێکی تر هەبێت، ئاوا بەردەوام بێت تاوەکوو هیچ سەرەتایەکی بۆ نەمێنێتەوە. ئەوە مەحاڵێکی عەقڵییە، لەبەرەوەش قوتابخانەی فەلسەفیی عەقڵی (سوقرات، ئەرستۆ، ئەفلاتوون، دیکارت و ...) بڕیاری دا کە «ڕیزبەندیی هۆکارەکان» شتێکی مەحاڵە. جا بەم هۆیەوە دەیانوت کە خودا هۆکاری یەکەمە، هۆکاری هەموو هۆکارەکانە، پێش ئەو هیچ ئەگەر و هۆکارێکی تر نییە، چونکە ئەگەر بەر لە خوا هۆکارێکی تر هەبێت، ئەویش پێویستی بە هۆکارێکی تر دەبێت، ئەو هۆکارەش پێویستی بە هۆکارێکی تر دەبێت، چونکە خوا پێش شوێنکات[1] (زمکان)[2] هەبووە، ئەو کات و شوێنی

---

(١) شوێنکات: واتا شوێن و کات. ئەم وشە لێکدراوە ئەکادیمیای کوردی لە بەرانبەر (زمکان)ی عەرەبییدا داڕشتووە. (وەرگێڕ)

(٢) زمکان: زاراوەیەکی فەلسەفیی سەردەمە و مانای: (الزمان والمكان)ە واتە: کات و شوێن.

دروست کردووە و پێویستی بە کات و شوێن نییە، ڕۆیشتنی کاتیش لە سەر ئەو جێبەجێ نابێت، بۆیە خودا هۆکاری یەکەمە و هۆکاری هەموو هۆکارەکانە.

**هەڵەی وتەی: "هەر شتێکی هەبوو؛ پێویستی بە هۆکارێک هەیە بۆ پەیدابوونی!"**

مولحیدەکان دەڵێن: باشە ئەگەر هەر شتێکی هەبوو دروستکەرێکی هەبێت، ئەی کێ خوای دروست کردووە؟

لە وەڵامدا دەڵێین: وتەی: "هەر شتێکی هەبوو، دروستکەرێکی هەیە!" هەڵەیە، دروستەکەشی ئەوەیە: "هەر شتێکی دروستکراو، پێویستی بە هۆکار و دروستکەرێک هەیە." یان هەر ڕووداوێک پێویستی بە هۆکارێک هەیە. لە ڕاستیشدا، خودا ئافرێنەرە (خالق) نەک ئافرێنراو (مخلوق). بۆیە ئەو پێویستیی بە هۆکار نییە، چونکە ئەو هۆکاری هەموو هۆکارەکانە. وەک فەیلەسووف و زانایانی لۆژیک و کەلامناسەکان سەلماندوویانە کە هەر پرسیارێکی مولحید بیکات، دەبێت پرسیارێکی ڕاست بێت، تا وەڵامی ڕاستی بدرێتەوە. کاتێک دەڵێن کێ ئافرێنەری ئافراندووە؟ ئەوە هەڵەیەکی لۆژیکی دەکەن، چونکە ئەگەر ئافرێنەر ئافرێندرابێت، ئەوا نابێتە ئافرێنەر (خالق)، بەڵکوو دەبێتە ئافرێنراو (مخلوق)، بۆیە پرسیارەکەیان: "کێ خوای ئافراندووە؟" لە لایەنی لۆژیکیەوە هەڵەیە، وەک ئەرستۆی فەیلەسووف لە زانستی لۆژیکدا باسی کردووە.

کەوایە ئەگەر پرسیار هەڵە بێت، ئەوا ناتوانرێت وەڵامی بدرێتەوە. بۆ نموونە، ئەگەر من هەموو زانا و پرۆفیسۆرەکانی بیرکاری کۆبکەمەوە، پرسیاریان لێ بکەم: "چۆن دەتوانن بسەلمێنن کە ١+١=٣؟" کەس لەو زانایانە ناتوانێت وەڵام بداتەوە. وەڵام نەدانەوەشیان ئەوە ناگەیەنێت کە ئەوان وەڵامەکە نازانن،

بەڵکوو ئەوە دەگەیەنێت کە پرسیارەکە لە ئەسڵدا هەڵەیە، بۆیە هیچ وەڵامێکی بۆ نییە.

بە هەمان شێوە پرسیارەکەشیان: "کێ خودای ئافراندووە؟" دەمانکێشێتە ئەوەی بڵێین: "کێ ئەو ئافرێنەرەی ئافراندووە؟" ئەمەش دەبێتە ڕیزبەندییەکی بێسەرەتا، ڕاستییەکەش ئەوەیە کە ئەم ڕیزبەندییە مەحاڵێکی عەقڵییە.

پێش نزیکەی بیست و چوار سەدە، ئەرستۆی فەیلەسووف بەشێوەیەکی ڕوون وەڵامی ئەو پرسیارەی داوەتەوە، بەڵام مولحیدان بۆ خەڵەتاندنی خەڵک ئەم پرسیارە دووبارە دەکەنەوە.

هەروەها سوقرات و ئەفلاتوون و ئەرستۆ بە بەڵگەی عەقڵیی یەکلاکەرەوە دووپاتیان کردووەتەوە کە هەبوونی خودا پێویستییەکی عەقڵییە، هەبوونی ئەو ئەزەلییە و بێ دەستپێکە.[1] پێویستی بە هیچ هۆکارێک نییە و هۆکاری هەموو هۆکارەکانە (علة العلل).

هەموو کەلامناس و زانایانی (ثیۆلۆجی)یە ڕۆژئاواکان[2] دەڵێن کە خودا هۆکاری یەکەمە، هیچ هۆکارێکی تر لەپێش ئەودا نییە. ئەم پرسیارەی مولحیدان لەسەر خوا بەجێ نایەت، چونکە خوا بەر لە شوێنکات (الزمکان)[3] هەبووە و پێویستیی بە کات و شوێن نییە و پرسیاری مولحیدانیش بە کات و شوێنەوە گرێدراوە. لە ئەسلیشدا ئەم پرسیارە هەڵەیەکی هزرییە.

---

(١) ئەزەلی: واتە بەردەوام و هەمیشە هەبووە و هەر دەبێت، بێسەرەتا و بێکۆتایە.

(٢) واتە زانایانی کریستیانی لاهووتناس (علماء اللاهوت) ئەوانەی پشت بە بەڵگەی عەقڵی دەبەستن بۆ سەلماندنی باوەڕ.

(٣) زمکان: زاراوەیەکی فەلسەفی سەردەمە. بە مانای: (الزمان والمکان)، واتە: کات و شوێن.

## ڕیزبەندیی هۆکارەکان لە هزری مادیگەرایی هاوچەرخدا

ئەگەر سەیری هزی مادیگەرایی (materialism) بکەین، دەبینین کە هەتا سەردەمی مارکسییەکانیش دەیانوت کە گەردوون ئەزەلییە، هەتا ساڵی ١٩١٢ش پێیان وا بوو ئەمە ڕاستییەکی زانستییە و دەیانوت: "گەردوون دروست نەکراوە، بەڵکوو هەمیشە هەبووە." دەیانوت: "مادام گەردوون ئەزەلییە، کەوایە پێویستیمان بە خودا نییە. ئەگەر خودا هەبووایە، ئەوکات گەردوون ئەزەلی نەدەبوو و دروست دەکرا." بەم جۆرە بڕیاریان دا کە هیچ خودایەک بوونی نییە.

ئیلحاد پشتی بەم بیرە بەستبوو، چونکە لە دەستپێکی سەدەی بیستەمدا زۆرینەی زانایان دەیانوت گەردوون ئەزەلییە و بێسەرەتایە. پەڕتووکە ئاسمانییەکانیش (تەورات و ئنجیل و قورئان) دەیانوت، گەردوون ئەزەلی نییە، بەڵکوو دروستکراوە (حادث - مخلوق) و لەلایەن خواوە ئافرێندراوە.

لەو دەمەدا مولحیدان دەیانوت: زانست بەسەر ئایین دەخەین، چونکە ئەوە ڕاستییەکی زانستییە کە گەردوون ئەزەلییە و نەئافرێنراوە.

بەڵام پەڕتووکە زانستییەکەی: «پەرەسەندنی گەردوون» (Evolution of the universe) بەدرێژی لەسەر ئەم بابەتە ئاخاوتووە، کە لە نووسینی «ئەلێکسەندەر فریدمان» (Alexander Friedmann)ی زانایە. هەروەها «جورج لومتەر» (Georges Lemaitre)ی زاناش گریمانەیەکی دانا کە گەردوون لە فراوانبووندایە و دوای ساڵی ١٩٢٧ ئەم گریمانەیە بوو بە تیۆرییەکی زانستی.

ل ساڵی (١٩٤٩)دا تیۆری تەقینەوە گەورەکە (Big Bang) وەک تیۆرییەکی زانستی پەسەند کرا، یەکەمین زانا کە ئەم ناوەی بۆ تیۆرییەکە دانا، زانای ئینگلیز، «فرید هویل» (Fred Hoyle) بوو.

چەند تیۆرییەک لەسەر دروستبوونی گەردوون هەن، بەڵام تا ئێستا ئەو

تیۆرییەی کە لە لایەنی زانستییەوە لە هەموویان باشتر و پەسەندترە، تیۆریی تەقینەوە گەورەکەیە. لەبەرەوە زانستی سەردەم و زانایانی فیزیکی و گەردوونی دووپات لەوە دەکەنەوە کە گەردوون دروستکراوە و ئەزەلی نییە، تەنانەت زانایانی مولحیدیش ئەوەیان دووپات کردووەتەوە. بۆیە لێرەدا پێویست بوو مولحیدانی ئەوکات باوەڕیان بە خودا هێنابووایە، چونکە بە شتێکی پێویستیان دانابوو کە ئەگەر گەردوون دروستکراو بێت، مانای وایە خوایەک هەیە. بەڵام باوەڕیان نەهێنا و گەڕانەوە بۆ «مەحاڵی ڕیزبەندی» ئەوەی کە بەر لە دوو هەزار و سێسەد ساڵ، سوقرات و ئەفلاتوون و ئەرستۆ نەیانهێشتبوو و بنبڕیان کردبوو.

دواتر مولحیدەکان ناچار بوون باوەڕ بە گریمانەی فرە گەردوونی (multiverse) بێنن، واتە: هەبوونی گەردوونانێکی لەڕادەبەدەر. دەیانوت: گەردوونی ئێمە لە هێزێکی ترەوە هاتووە، ئەو هێزیش لە گەردوونێکی ترەوە هاتووە لە دەرەوەی گەردوونی ئێمە، ئەویشیان لە هەندێک گەردوونی ترەوە هاتووە، بەم جۆرە لە ڕیزبەندییەکی بێدەستپێکەوە دروست بووە. لە ڕاستیشدا ئەم ڕیزبەندییە مەحاڵە. هەروەک قوتابخانە عەقڵییەکان و زانای (ثیۆلۆجی)[1] و کەلامناسان و پەڕتووکە ئاسمانییەکان دووپاتیان کردووەتەوە کە مەحاڵێکی عەقڵییە.

ئەی بۆچی ئەم کەسانە ئەم گریمانەیان دانا؟ لە کاتێکدا چەندین هەڵەی لۆژیکی (مغالطة)ی گەورەی تێدا هەن.

ئەگەر بە مولحیدەکان بڵێیت: خودایەک ئەم گەردوونەی داناوە، دەڵێن: خودا ناکەوێتە ژێر هەستەکان و تاقیکردنەوە. بۆیە باوەڕ ناهێنن و تەنیا باوەڕ بەو شتانە دێنن کە دەکەونە ژێر هەست و تاقیکردنەوەوە. هەر لەبەر ئەم

---

(١) واتە زانایانی کریستیانی لاهوتناس (علماء اللاهوت)، ئەوانەی پشت بە بەڵگەی عەقڵی دەبەستن بۆ سەلماندنی باوەڕ.

هۆکارەش باوەڕ بە جیهانی بەرزەخ و ڕۆژی دوایی ناهێنن.

ئەی ئەوان چۆن باوەڕ بە تیۆریی فرەگەردوونی (multiverse) دێنن؟ لەکاتێکدا دەڵێت کە ملیارەها و بێ ئەندازە گەردوون هەن و گەردوونی ئێمەش لە هێزی ئەو گەردوونانەوە هاتووە. ڕوونیشە کە «ستیڤن هاوکینگ» یەکێکە لەو زانایانە و باوەڕی بەم تیۆرییە هەیە.

ئەی چۆن باوەڕ بە هەبوونی ئەو گەردوونانە دێنن، لەکاتێکدا ئەو گەرردوونانە ناکەونە ژێر هەست و تاقیکردنەوەدا؟! تەنانەت بە ڕێگای زانستیشەوە ناتوانن ئەو گەردوونانە ئاشکرا بکەن، چونکە بەپێی تیۆریی تەقینەوە گەورەکە (Big Bang)، ئەگەر زانست بتوانێت ئامێرێک دروست بکات کە خێراییەکەی وەک خێرایی ڕوناکی بێت (٣٠٠,٠٠٠) کم لە چرکەیەکدا بڕوات، ئەوکات پێویستیمان بە ١٣ ملیار ساڵ و ٨٠٠ هەزار ساڵ دەبێت تا بتوانین لە گەردوونی خۆمان بڕۆینە دەرەوە و بڕۆین بۆ هەندێک گەردوونی تر و بە ئاشکرا بیانبینین. ئەمەش مەحاڵێکی عەقڵییە و ناتوانین بیکەین. جا ئەگەر گەیشتن بەو گەردوونانە مەحاڵ بێت، ئەی باشە چۆن مولحیدەکان باوەڕ بە بوونیان دێنن و بێئەوەی یەک بەڵگەیان لەسەر هەبێت؟ بەڕاستیش ئەمە هەڵەیەکی لۆژیکیی گەورەیە لە فیکری ئیلحاددا.

## ٢. مەحاڵی بازنەیی (محال الدور)

## جۆرەکانی مەحاڵی بازنەیی:

جۆری یەکەم: ئەوەیە، ئەگەر ئەوەی یەکەم هۆکار بێت بۆ ئەوەی دووەم و ئەوەی دووەمیش هۆکاری ئەوەی یەکەم بێت لە هەمان کاتدا. ئەمەش مەحاڵێکی عەقڵییە، چونکە لە یەک دەمدا دوو دژیەک دەکەونە لای

یەک. بۆ نموونە، (أ) هۆکار بێت بۆ هەبوونی (ب) و (ب)یش هۆکار بێت بۆ هەبوونی (أ) لە هەمان کاتدا.

ستیڤن هاوکین گ (Stephen Hawking) لە پەڕتووکەکەیدا «دیزاینی گەورە»(The Great Design)دا دەڵێت: " دروستبوونی گەردوون لە هێزی ڕاکێشانەوە درست بووە."[١] واتە هێزی کێشکردن هۆکاری بوونە، بوونیش هۆکاری هێزی کێشکردنە. بەمەش زۆر ڕەخنەی لێ گیرا، چونکە هێزی کێشکردن لە نەبوونەوە نابێت، بەڵکوو لە هەبووندا هەیە. واتە پێویستە بوون پێش هێزی کێشکردن هەبێت. بەڵام چۆن هێزی کێشکردن بوون دروست دەکات، لەکاتێکدا بوون پێش هێزی کێشکردن هەبوویێت؟! بەم جۆرە زۆر ڕەخنەی فەلسەفی و لۆژیکی لێ گیران، دیاریشە کە ئەو گریمانەیە شتێکی ئەستەمە لەلای فەلسەفەی عەقڵی و لۆژیکیشەوە، لەبەر ئەمەش ستیڤن هاوکین ناچار بوو و وتی: "فەلسەفە زانست نییە، فەلسەفە و لۆژیک مردوون و ناشتوانین پشت بە یاسا لۆژیکییەکان ببەستین."[٢] کاتێک کەسانی باوەڕدار خۆیان لە فەلسەفە و لۆژیک دوورخستەوە، کەسانی مولحید بۆ خۆیان بەکاریان هێنا. بەڵام کاتێک باوەڕدار گەڕانەوە بۆی و خوێندییان و وەک ئامێرەکی کوژەک لە دژی هزری مولحیدانیان بەکارهێنا، بە ڕێگاکانی فەلسەفە و لۆژیک بنەماکانی ئیلحادیان شکاند، ئەوکات مولحیدانیش بەناچارییەوە دوورکەوتنەوە و هەندێک بیانووی تریان بۆ خۆیان دۆزییەوە. وەک ستیڤن هاوکینگ

---

(١) التصميم العظيم (The Great Design)، استيفن هاوكينك: (١٧٠ – ١٨٠)... براهين وجود الله، د.سامي العامري: (٤٣٥).

(٢) فەیلەسووفی ئەمریکیی سەردەم(غراهام هارمن - Graham Harman) لە لێکۆڵینەوەکەیدا بە ناوی(حول زعم استيفن هاوكينك ان الفلسفة ماتت) بە شێوەیەکی زانستی و عەقڵانی وەڵامی ستیڤن هاوکینگ دەداتەوە و دوویات دەکاتەوە کە هاوکینگ هەڵەیەکی گەورەی کردووە. بۆ زانیاری زیاتر سەیری ئەم لێکۆڵینەوە زانستییە بکەن: (حول زعم استيفن هاوكينك ان الفلسفة ماتت): (٥ - ٦).

وتوویەتی: "هێزی کێشکردن بوونی هەبووە و لە گەردوونە بێشومارەکانەوە (multiverse) هاتووە".[1] ئەمەش بۆئەوەی خۆی لەو ڕەخنانە ڕزگار بکات کە دەیخەنە ناو «مەحاڵی بازنەیی»، بەڵام کەوتە ناو «مەحاڵی ڕیزبەندی»یەوە، ئەوەی پێشتر باسمان لێیەوە کرد.

## ٣- مەحاڵی زاڵکردن بەبێ زاڵکەر (استحالة الرجحان بدون مرجح)

لای زانایانی کەلامناس؛ ئەو فیکرانەی لە بیرکردنەوەی مرۆڤدا هەن، بۆ سەر سێ ئەحکامی عەقڵی دابەش دەکرێن:

**یەکەم:** پێی دەڵێن: پێویستە هەبێت (واجب الوجود): واتە ئەوەی کە عەقڵ هەبوونی بە پێویس (واجب) دادەنێت. پێویستیشی بە هیچ هۆکارێک نییە بۆ بوونی و خۆیشی هۆکاری هەموو هۆکارەکانە.

**دووەم:** پێی دەڵێن: مەحاڵە هەبێت (مستحیل الوجود)، واتە ئەوەیە کە عەقڵ مەحاڵی دەکات و نەبوونی بە پێویست (واجب) دەزانێت.

**سێیەم:** پێی دەڵێن: دەکرێت هەبێت و دەکرێت نەبێت (ممکن الوجود)، یانیش (جائز الوجود) واتا عەقل هەبوون و نەبوونی قوبووڵ دەکات، بەڵام بوونی شتی (ممکن) پێویستی بە هۆکارێکە تا لە نەبوونەوە بێتە بوون.

جا بوونی هەر شتێک پێویستی بە هۆکارێک (السبب - المرجح) هەیە. بۆ نموونە، ئەگەر بڵێین: ئافرەتێک منداڵێکی بووە، ئەم قسەیە مومکینە و ڕێی تێدەچێت (دەشێت وابێت و دەشێت وانەبێت)، ئەگەر منداڵەکە نەبێت، ئەوا

---

(١) التصميم العظيم (The Great Design)، استيفن هاوكينك: (١٨٠). و - براهين وجود الله، د.سامي العامري: (٤٣٦).

پێویستی بە هیچ هۆکارێک نییە، بەڵام ئەگەر منداڵی هەبێت ئەوا پێویستە هاوسەرێکی هەبێت، یان هەر ڕێگایەکی تر بێت، بەڵام دەبێت پیاوێک یان تۆوی پیاوێک هەبێت تا بتوانێت منداڵی هەبێت. واتە مەحاڵە بێ هۆکار ئەو منداڵە بووبێت و پێویستییەکی عەقڵیشە هۆکارێک هەبێت.

هەر وەک تەرازووێک، هەردوو لایەن وەک یەکن، ئەگەر یەکێکیان کەوتە ئەرز، ئەوکات دەبێت هۆکارێک هەبێت بۆ ئەوەی کە ئەو لایە کەوتووە و ئەوەی تر بەرز بووە. بۆیە هەبوون و نەبوونی شتێکی مومکینە.

نەبوون پێویستی بە هیچ هۆکارێک نییە، بەڵام بوون پێویستی بە هۆکارێک هەیە (ئەویش ئەو هۆکارەیە کە شت لە نەبوونەوە بێنێتە بوون.).

بۆیە لە هەڵەی گەورەی مولحید ئەوەیە کە دەیانوت گەردوون ئەزەلییە (هەمیشە هەبووە)، لەبەرەوەش پێویستی بە هیچ هۆکارێک نییە، بەڵام کاتێک بە بەڵگەی زانستیی یەکلاکراوە سەلمێنراوە کە گەردوون ئەزەلی نییە، بەڵکوو هاتووەتە بوون. واتە گەردوون نەبوو، بەڵام دواتر هاتووەتە بوون، بۆیە لێرە دەبوو مولحیدان باوەڕیان بە هۆکاری هەبوون هێنابووایە، بەڵام ڕەتیان کردەوە کە هەبوونی گەردوون پێویستیی بە هۆکارێک هەبێت. وتیان هەر لەخۆیەوە دروست بووە، یان لە هێزی هەندێک گەردوونی ترەوە دروست بووە! ئەوەش هەڵەیەکی لۆژیکیی گەورەیە و مەحاڵێکی عەقڵییە، وەک لە پەڕەکانی پێشوودا باسمان لێوەی کرد.

نموونەیەکی زانستی: هەبوونی خانەی یەکەم (الخلیة الاولی)؛ مولحیدان باوەڕیان بەوە هەیە کە خانەی یەکەم نەبووە و دواتر هاتووەتە بوون، بەڵام باوەڕ بەوە ناهێنن کە هۆکارێک هەبوویێت بۆ دروستبوونی خانەی یەکەم. ئەمەش مەحاڵێکی عەقڵییە و هەڵەیەکی لۆژیکییە کە شتێک لە نەبوونەوە هاتبێتە بوون بێ ئەوەی هۆکارێکی بۆ هەبێت. ئێمەش بە شێوەیەکی زانستی و عەقڵی

و لۆژیکی دەیسەلمێنین کە خانەی یەکەم بێ هۆکار دروست نەبووە، بەڵکوو پێویستیی بە هۆکارێک هەیە ئەویش خوای گەورەیە.

لە سەردەمی داروینـدا (Charles Darwin) زانست وەک ئێستا پێشکەوتوو نەبوو، داروین پشتی بە «لەدایکبوونی خودی/پەیدابوونی خودی» (التوالد الذاتي) دەبەست، بۆیە پێشبینی ئەوەی دەکرد کە دەکرێت گیانەوەر لە شتی بێگیان پەیدا ببن.

لەبەرەوەش داروین پێشبینی ئەوەی کرد کە خانەی یەکەم لە سروشتێکی بێگیان پەیدابووبێت.

دوای ئەوەی داروین تیۆری پەرەسەندنی دانا، چەندین زانای گەورە و بەناوبانگ لەسەر ئاستی جیهان سەلماندیان کە دروستبوونی خانەی یەکەم بەڕێکەوت شتێکی مەحاڵە لە زانستدا و پێویستە بە شێوەیەکی عەقڵی و زانستی هۆکارێک بۆ بوونی خانەی یەکەم هەبێت.

لەو زانایانەش:

١- زانای فەڕەنسی (لویس پاستور Louis Pasteur) دەڵێت کە هەموو بارودۆخێکمان ڕەخساند و پرۆتینی سەرەکیمان بۆ دروستکردنی خانەی یەکەم دابین کرد، دوای زۆر هەوڵی بەردەوام، نەمانتوانی خانەی یەکەم دروست بکەین. وتیشی: "مەحاڵە خانەی یەکەم لە شتی بێگیان دروست بێت."

پاستور وتیشی: بەپێی زانست، گریمانەی لەدایکبوونی خودی هەڵەیەکی زۆر گەورەیە. ئەم قسەیەشی لە پەڕتووکەکەیدا (Molecular Evolution and the origin of life) باس کردووە.

٢- زانای ڕووسی (ئەلێکساندەر ئوپارین Alexander Oparin) لە پەڕتووکەکەیدا بە ناوی (The Origin of Life)دا دەڵێت: "خانەی یەکەم

ڕەشترین خاڵە لە تیۆری پەرەسەندندا."

٣- پرۆفیسۆر (ڕۆبێرت شابیرو Robert Shapiro) لە پەرتووکەکەیدا (A Sceptics Guide to the Creation of Life on Earth)دا دەڵێت: "هۆکاری هەبوونی هەموو جۆرە پرۆتینێک لە خانەی مرۆڤدا (الخلية البشريه) -بە شێوەی ڕێکەوت- پێویستی بە ((١٠٤٠٠٠٠ دەتوان چل هزار هەیە، واتە: وەک ئەوەی ژمارە یەک دابنێیت و چل هەزار سفری لەدوایدا دابنێیت. ئەمەش ڕوونە کە ڕێژەیەکی وا بەپێی زانستی بیرکاری شتێکی مەحاڵە.

٤ - پروفیسۆری ئینگلیز (فرید هویەل Fred Hoyle) لە پەرتووکەیدا (Evolution from space)دا دوویات دەکاتەوە کە لە زانستدا هەبوونی خانەی یەکەم و دروستبوونی بە شێوەی ڕێکەوت شتێکی مەحاڵە، جەختیشی لەوە کردەوە کە دروستبوونی خانەی یەکەم پێویستیی بە دەستێکی دەرەکی هەیە.

٥ — زانای ئەمریکی (دەیڤید بیرلنکسی David Berlinski) لە پەرتووکەکەیدا (وەهمی شەیتان - The Devil's Delusion)دا دوویات دەکاتەوە کە بۆچوونی زانایانی ئیلحاد لە پرسی دروستبوونی خانەی یەکەم لە سروشدا و بە شێوەی ڕێکەوت، هەمووی بۆچوونی هەلەقوپەلەقن و هیچ بەڵگەیەکی زانستییان لەسەر نییە.

٦ - فەیلەسووف و زانای ئینگلیز (ئەنتونی فلو - Antony Flew) لە پەرتووکەیدا (There is a God)دا دوویات دەکاتەوە کە مەحاڵە ژیان لە شتی بێگیانەوە پەیدا ببێت. دەشڵێت: بەڵگە زانستییەکان هەموویان لە بەرژەوەندیی باوەڕهێنان بە خودان.

٧- زانای ئەمریکی (مایکل بیهی - Michael Behe) پسپۆر لە زانستی کیمیاییدا، لە پەرتووکەکەیدا (Darwin's Black Box) دوویات لەوە دەکاتەوە

و دەڵێت: داروین خۆی باوەڕی بەوە هەبووە کە خوا خانەی یەکەمی ئافراندووە، زۆر بەڵگەی زانستییش دێنێت کە مەحاڵە خانەی یەکەم لەخۆوە و بەڕێکەوت دروست بووبێت

ئەمانە هەمووی بەڵگەی عەقڵی و زاستیی یەکلاکەرەوە بوون لەسەر مەحاڵیی دروستبوونی خانەی یەکەم لەخۆوە و کە لە نەبوونەوە هاتبێتە بوون، واتە پێویستە هۆکارێک هەبێت لە نەبوونەوە بیهێنێتە بوون.

# بەشی چوارەم

# هەڵەی گریمانە ماددییەکان لەبارەی بوونی گەردوون و ژیان

لە پەڕتووکێکمدا لەبارەی بابەتی ئیلحاد[١]، بە بەڵگەی عەقڵی و فەلسەفی و لۆژیکی و زانستی دووپاتم کردووەتەوە کە هەبوونی خودا بە شێوەیەکی فیتری لە مرۆڤدا چێندراوە. هەبوونی خوا پێویستییەکی عەقڵییە و بوونیشی ئاشکراترە لەوەی بە ڕێگای بەڵگەکانەوە ببینرێت. ئەمەش لەبەرەوەی خودا گەورەتر و ڕوونترە لەوەی بە بەڵگەی عەقڵی و زانستی ببینرێت، چونکە هەر گەردیلەیەک لە گەردیلەکانی گەردوون، هەر بوونەوەرێکی زیندوو، هەموو هەسارە و گالاکسییە گەورەکان پێویستییان بە خودایەکی گەورە هەیە و لەبەرانبەریدا هەژارن و خوداش لە هەموو شتێکدا بێمنەتە.

بەڵام گریمانە ماددیە کۆنەکان و دەرکەوتنی ڕێبازە ماددیگەراکانی ئیلحادی هاوچەرخ فیترەتی مرۆڤیان شێواندووە. بڵاوبوونەوەی فیکرەکانیان دەربارەی گریمانەی پەیدابوونی گەردوون بەڕێکەوت (صدفة)، دروستکردنی گومانکاری لەبارەی یەکییێتی خودا و هەبوونی، تاریکاییەکی لە هزری ئەو کەسانەدا دروست کرد کە خۆیان بە زانست و باوەڕ قایم نەکردبوو.

جا ڕێژەیەکی زۆری خەڵکی خەڵەتێندران و کەوتنە دوای ئەو ڕێبازانە. لەولاشەوە، لەبەرانبەر ئەو گومانکارییانەدا کۆمەڵێک زانا و بیرمەندی موسڵمان دەرکەوتن و وەڵامی شەکەکانیان دایەوە. لەوانەش زانای گەورەی کورد،

---

(١) پەرتووکی «ئیلحاد»، نووسینی د. ئاماد کازم

سەعیدی نوورسی دەستپێشخەریی کرد بۆ نووسینی چەند پەڕتووکێک لەبارەی زانستی سروشتی ماددی بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو ڕێبازانە بە بەڵگەکانیانەوە و بەتاڵکردنەوەیان. بەم جۆرە بەڵگەکانیانی لە دژی گریمانەکانیانی بەکارهێنانەوە. هەروەها بە پشتبەستن بە شیکاری فەلسەفی و زانستی و ڕاستییەکانی قورئانی پیرۆز بنەماکانی باوەڕی سەلماند.

کۆمەڵێک گریمانەی ماددی لە دژیی ڕاستی بنەماکانی باوەڕ بڵاوکراونەتەوە. ئێمە لێرەدا باسی چوار گریمانەی بەربڵاو دەکەین و بە شێوەیەکی عەقڵی و زانستی و فەلسەفی هەڵەکانیان دەخەینە ڕوو:

## گریمانەی یەکەم: پەیدابوونی گەردوون بەبێ هۆکار

هەموو ئەو گریمانە و مەحاڵە عەقڵییانەی ئاماژەمان پێ دان و هەڵەکانیانمان نیشان دان، لە خاڵێکدا هاوبەش بوون، ئەویش شکاندنی یاسای هۆکاری (السببية)یە. ئەم یاسایە یەکێکە لە یاسا عەقڵییە سەرەتاکان کە لای هەموو مرۆڤێکەوە هەیە و هەمووان قایلن لەسەری، شتێکی خوارِسکە و لە مێشکی مرۆڤدا چێندراوە و هەر لە ساتی لەدایکبوونییەوە لەگەڵیدا دروست دەبێت.

یاسای هۆکاری یاسایەکی لۆژیکییە و هەموو فەیلەسووفانی قوتابخانەی عەقڵی (سوقرات، ئەفلاتوون، ئەرستۆ، دیکارت و ... هتد) لەسەر ئەوە یەکدەنگن، هەروەها هەموو کەلامناس و زانایانی زانستی لاهووتی (Theologians) لەسەر ئەوە یەکدەنگن. واتە مێشکی ساخلەم و لۆژیکیش دەڵێت هەر شتێک کە لەم گەردوونەدا دەیبینین هۆکارێکی پەیدابوونی هەیە و لەخۆیەوە دروست نەبووە.

واتە بەپێی ئەو یاسا بنەمایەی عەقڵ بە ناوی: «گەڕانەوە بۆ بنەڕەت»

(استصحاب الأصل) پێویستە هۆکارێک بۆ دروستبوونی گەردوون هەبێت.

ناوەڕۆکی یاساکە ئەوەیە کە هەر ڕووداوێک لە بووندا پێویستیی بە هۆکارێک هەیە، دیاریشە کە گەورەترین ڕووداو «دروستبوونی گەردوونە». بۆیە ئەوە پێویستییەکی عەقڵییە هۆکارێک بۆ هەبوونی ئەو گەردوونە هەبێت. واتە مادام گەردوون دروستکراوە، پێویستە دروستکەرێکیشی هەبێت. ئەو دروستکەرەش دەبێت بوونی خۆی لە خودی خۆیەوە بێت و پێویستی بە هیچ هۆکارێک نەبێت بۆ بوونی خۆی. هەر وەک پێشتر لە بابەتی مەحاڵە عەقڵییەکاندا ئەوە سەلمێنرا، بەتایبەت لە بابەتی مەحاڵی ڕیزبەندی.

لێرە دەمەوێت ئاماژە بە بابەتێکی فەلسەفی بکەم: ئەو باسوخواسەی لەنێوان باوەڕدار و مولحیددا هەیە لەبارەی ئەوەی کە پێویستە کام لا بەڵگە بێنن. ئایا دەبێت باوەڕدار بەڵگە بێنێت و بیسەلمێنێت کە لە بنەڕەتدا خودا بوونی هەبووە؟ یان پێویستە مولحید بەڵگە بێنێت کە خودا نییە و ئایینەکان نەبوونە و لە بنەڕەتدا ئیلحاد هەبووە؟

لە وەڵامدا دەڵێین: ئەم پرسیارە لە زۆر پەڕتووکی فەلسەفی و کەلامیشدا هاتووە و وەڵامەکەی ئاڵۆزە. باسوخواسی زۆر هەیە لەسەر ئەوەی کە ئایا کێ دەبێت بەڵگە بهێنێت؟ ئایا بێباوەڕ دەبێت نەبوونی خوا بسەلمێنێت، یان باوەڕدار پێویستە بەڵگە بهێنێت کە خوا هەیە و ئایینەکان لای خواوە نێردراون؟ لە بنیاتی بەڵگەهێنانەوەدا، زۆر لە فەیلەسووفان و فەیلەسووفە دیالێکتییەکان باوەڕیان وایە ئەوەی پێی وایە خودا هەیە، پێویستە بەڵگە بهێنێت و بسەلمێنێت کە خودا هەیە.

بەڵام زانایانی کەلامناس جەخت لەوە دەکەنەوە کە پێویستە بێباوەڕان بەڵگە لەسەر نەبوونی خوا بێنن و نەبوونی خوا بسەلمێنن، بەپێی ئەو بنەمایەی فەیلەسووفان دایانناوە. یەکێک لەو بنەمایانە پێوەری گەڕانەوەیە (استصحاب)

واتا چەمکی بنیات (مفهوم اصل)، ئەوە بنیاتێکی لۆژیکییە، بنیاتێکی فەلسەفی و کەلامییە، بنیاتێکی بنچینەییە (اصولی) و بنیاتێکی یاساییشە؛ ئەم بنیاتە پێی وایە ئەگەر دیاردەیەک لە بووندا بەردەوام بێت و بنەڕەتی دیاردەکە بەو شێوەیە بێت کە هەیە، دواتر کەسێک بێت و ڕەخنە لەو دیاردەیە بگرێت و بە هەڵە و وانەبوو دایبنێت، ئەوا دەبێت ئەو کەسە بەڵگە بهێنێت و بیسەلمێنێت کە دیاردەکە وا نییە.

نموونەیەک دێنینەوە، هەرچەندە لەسەر ئیلحاد نییە، بەڵام بۆ ڕوونکردنەوە و تێگەیشتن گونجاوە: ئەگەر کەسێک بە دزیکردن تۆمەتبار بکەم، لێرەدا من ئەوم تۆمەتبار کرد و پێویستە من بەڵگە بێنم تا بسەلمێنم کە دزییەکەی کردووە، نەوەک ئەو بەڵگە بێنێت کە دزیی نەکردووە. چونکە لە ئەسڵ (مفهوم الأصل)دا، ئەو کەسێکی بێتاوانە. جا کاتێک من سەرپێچیی بنەمام کرد، ئەوکات دەبێت من بەڵگە لەسەر قسەی خۆم بێنم.

ئەگەر بێین بڕوانینە بەڵگەی کۆزمۆلۆژی (گەردوونی – Cosmolog) کە ئەرستۆ دانەریەتی، ئەم بەڵگەیە دەڵێت: "هەر شتێک گۆڕانی تێدا بکرێت، ئەو شتە دروستکراوە و پێویستە دروستکەرێکی هەبێت."

با نموونەیەکی سادە بێنینەوە: هەر ئامێرێک بێت، بێینین و پرسیار لە هەموو خەڵکی جیهان بکەین ئاخۆ ئەم ئامێرە خۆی دروست بووە یان دروستکەرێکی هەیە؟ بە پێوەری عەقڵی و لۆژیکی دەبێت دروستکەرێکی هەبێت. ئەوەش زانینێکی زگماکە، بۆیە هەموو خەڵک دەڵێن دروستکەرێکی هەیە. تەنانەت منداڵێکی بچووکیش دەزانێت کە دروستکەرێکی هەیە. واتا زانینێکی زگماکیمان هەیە کە هەر شتێکی دروستکراو دروستکەرێکی هەیە.

بۆ نموونە ئەگەر بڵێم: ئەم مۆبایلە دروستکەرێی هەیە. بەڵام تۆ بڵێیت: نەخێر وانییە. لێرەدا لەسەر من پێویست نییە بەڵگە بێنم، بەڵکوو لەسەر تۆ

پێویستە بەڵگە بێنێت لەبارەی ئەوەی چۆن لەخۆیەوە دروست بووە؟! چونكە تۆ سەرپێچی بنەمای لۆژیكت كردووە، نەک من. خۆ ئەگەر ئێمە نەیشزانین كێ مۆبایلەكەی دروست كردووە، هەر باوەڕمان وایە كە دروستكەرێكی هەیە.

جا زۆرجار لە كاتی بەڵگەهێنانەوە لەنێوان مولحید و باوەڕدار، مولحید بە باوەڕدار دەڵێت: ئایا تۆ بینیوتە كێ گەردوونی دروست كردووە؟ وەڵام: من نەمبینیوە، بەڵام نەبینینی من نابێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی دروستكەرێک نەبێت. مولحید دەڵێت: مادام بە چاوی خۆت نەتبینیوە، كەوایە گەردوون دروستكەری نییە. سەیركە مولحید گفتوگۆكە بە چی ئاقارێكدا دەبات و چۆن هەڵەی لۆژیكی دەكات! واتە هەروەک چۆن بەپێی لۆژیک دەبێت دروستكەر بۆ هەموو دروستكراوێک هەبێت، بۆیە بە هەمان شێوە دەبێت دروستكەرێک بۆ گەردوونیش هەبێت. نەبینینی دروستكەریش، مانای نەبوونی دروستكەر ناگەیەنێت، چونكە هەبوونی دروستكەر كە خودایە، شتێكی خوارِسكییە، بوونیشی بە زۆر بەڵگەی فەلسەفی، لۆژیكی، عەقڵی و زانستی سەلمێندراوە، هەروەک باشترین فەیلەسووف و كەلامناس و زانا ناسراوەكان ئەوەیان دووپات كردووەتەوە.

دوای ئەوەیشی سەلماندمان كە بەپێی پێوەری گەڕانەوە (الاستصحاب) مەفهوومی بنەمایی، ئەوەی سەرپێچی بنەما و بنەڕەت بكات، ئەوا ئەو پێویستە بەڵگە بێنێت. لێرەدا دووپات دەكەینەوە كە مولحید سەرپێچیی ئەم یاسایەی كردووە كاتێک یاسای هۆكاری (قانون السببية)یان شكاندووە و بوونی دروستكەریان بۆ گەردوون ڕەتكردووەتەوە.

بەم جۆرە دەتوانین بە شێوەیەكی زانستی دووپات بكەینەوە كە گەردوون پێویستیی بە دروستكەرێكی خاوەن هێز و دەسەڵات هەیە.

هەتا ساڵی ١٩١٢ دەوترا گەردوون ئەزەلییەوە و دروستنەكراوە، واتا تا

ساڵی ١٩١٢ باوەڕدار پێویست بوو بەڵگە بێنێت و بسەلمێنێت کە خودا هەیە، بەڵام دوای ١٩١٢ و سەرهەڵدانی گریمانەی تەقینەوە گەورەکە (Big Bang) لەلایەن چەندین زانای ڕۆژئاوا، هەر وەک لە پەڕتووکی (Evolution of the universe) کە هەندێک لە زانایانی وەک «ئەلکسندر فریدمان» و زانای بەلجیکی «جورج لومتەر» وتیان: گەردوون ئەزەلیی نییە، بەڵکوو دروستکراوە. لە ساڵی ١٩٢٧ ئەم وتەیە لە گریمانەوە بوو بە تیۆرییەکی زانستی و دواتر بوو بە ڕاستییەکی زانستی و لە ڕێگەی زانستە سەردەمییەکانەوە سەلمێنرا کە گەردوون ئەزەلی نییە، بەڵکوو دروستکراوە و پێویستە دروستکەرێکی هەبێت.

زانای ناودار «ئەنتونی فلو» لە پەڕتووکەکەیدا، بە ناوی (There is a God) دەڵێت: "باشترین بەڵگەی کۆزمۆلۆژی (گەردوونناسی) ئەوەیە کاتێک سەلمێنرا کە گەردوون دروستکراوە و بەپێی لۆژیک پێویستە دروستکەرێک هەبێت." لە ساڵی ٢٠٠٤ ڕایگەیاند کە بووەتە باوەڕدار[١] و وتی: "دەڵێن دانپێنان لەلایانی دەروونییەوە سوود بە مرۆڤ دەگەیەنێت، جا دان بەوەدا دەنێم کە نموونەی تەقینەوە گەورەکە هۆکارێکی بەهێزی لاوازکردنی فیکری مولحیدەکانە، چونکە زانست دووپاتی لە شتێک کردووەتەوە کە ئایینەکانیش ئەوە پشتڕاست دەکەنەوە."[٢]

بەم جۆرە بۆمان دەردەکەوێت کاتێک مولحید دەڵێت: کەس ئەم گەردوونەی دروست نەکردووە، ئەوکات پێویستە ئەو بەڵگە بێنێت کە چۆن ئەم گەردوونە دروست نەکراوە و لەخۆیەوە دروست بووە، چونکە بەپێی زانست مەحاڵە خانەیەک خۆی دروست بێت، ئەی چۆن ئەو گەردوونە سەرسوڕهێنەرە لەخۆیەوە دروست دەبێت؟!

---

(١) باوەڕی بە بوونی خوا هێنا، بەڵام باوەڕی بە هیچ ئایینێک نەهێنا.

(٢) پەڕتووکی: (هناك إلـه)، انتوني فلو. و رحلة العقل، عمرو الشريف: (٦٦ - ٧٩).

## نارِەزایی «ڕاسل» (Russell) و وەڵامدانەوەمان بۆی

بیرمەندی ناودار، «بێرتراند ڕاسل» (Bertrand Russell) دەڵێت: نەخێر؛ پێویستە باوەردار بەڵگە بێنێت و بسەلمێنێت کە خودا هەیە. نموونەیەک دێنێت و دەڵێت: ئەگەر بڵێم قۆرییەکی چا لە دەوری خۆر دەخولێتەوە و لەنێوان ئەرد و مەریخدایە، ئەوکات دەبێت من بیسەلمێنم کە ئەم قۆریە چایە لە دەوری خۆر دەسووڕێتەوە. بە هەمان شێوە کاتێک باوەڕدار دەڵێت خودا هەیە، دەبێت ئەو بەڵگە بێنێت کە خودا هەیە، نەک مولحید بسەلمێنێت کە خودا نییە.

وەڵاممان بۆی: بیرمەندی ناودار «بێرتراند راسل» لە وتەکەیدا بەڵگەی پێوان (القیاس)ی بەکارهێناوە، بەڵام پێوانەکەی زۆر هەڵەیە، ئەمەش بەپێی چەند بنەمایەکی لۆژیکی.

یەکەم: ئەمە قسەیەکی خەیاڵییە، سادەترین عەقڵیش ڕەتی دەکاتەوە، بەڵام بوونی خودایەک بۆ گەردوون شتێکی خوارِسکی، لۆژیکی، عەقڵی و زانستیشە. بۆیە نابێت پێوانەی شتێکی خەیاڵی لەسەر شتێکی لۆژیکی بکرێت کە بوونی پێویستییەکی عەقڵی فەرز بێت (واجب الوجود).

دووەم: قۆریی چا شتێکی دروستکراوە، پێویستی بە دروستکەرێک هەیە، واتە شتێکی تەواو نییە. بەڵام خوا ئەزەلییە و تەواوە. جا نابێت پێوانەی شتێکی دروستکراوی ناتەواو لەسەر خاوەنی دروستکردن جێبەجێ بکرێت.

سێیەم: ئەوەی سەرپێچی ئەسڵ و بنەما بکات، دەبێت بەڵگە بهێنێت، چونکە لە ئەسڵدا و بەپێی زانستیش هیچ قۆرییەکی چا لە ئاسمان نییە. بۆیە پێویستە ئەو بەڵگە بێنێت بۆ قسەکەی، نەک بەرانبەرەکەی. لەبەرەوەش زۆر لە فەیلەسووفان ڕەخنەیان لە «ڕاسڵ» گرت لەسەر ئەو بەڵگەیە.

ئینجا سەرەڕای ئەوەی کە مولحید پێویستە بەڵگە بێنێت، هیچ شتێک

ڕێگر نییە کە ئێمەی باوەڕداریش بەڵگە بێنینەوە، چونکە ئەرز و ئاسمان پڕیەتی لە بەڵگەی بوونی خودا.

ئەم قسەیەشمان بۆ کەسێکە کە لەسەر بنەمایەکی فەلسەفی بووەتە مولحید، بەڵام لای ئێمە هیچ مولحیدێکی لەو شێوەیەمان نییە، بەڵکوو مولحیدانمان چاولێکەری مولحیدە عەرەبەکانن و عەرەبەکانیش چاولێکەری ڕۆژهەڵاتناسەکانن (مستشرق). ئامانجیشیان تەنیا دژایەتی باوەڕدارانە، بەتایبەت دژایەتی موسڵمانان، نەک بەدواداچوونی بەڵگە و زانست. بەڵام سەرەڕای ئەوەش بەڵگەی یەکلاکەرەوە لەسەر بوونی خودا هەن لە بەڵگەی فیتری و خوارِسکی، فەلسەفی، لوژیکی، زانستی، واقیعی و ... هتد.

## گریمانەی دووەم: ڕووداوە ماددییەکان ژیانیان دروست کردووە!

واتە ڕووداوە ماددییەکان بە شێوەی ڕێکەوت (الصدفة) بوونەتە هۆکاری پەیدابوونی ژیان و لە نەبوونەوە شتیان هێناوەتە بوون. بەڵام زانای ناودار، سەعیدی نوورسی دووپاتی لەوە کردووەتەوە کە ئەم گریمانەیە هەڵەیەکی هزرییە، ئەمەش بەهۆی ئەوەی چەندین شتی مەحاڵ لەخۆی دەگرێت:

مەحاڵی یەکەم: زانای کورد، سەعیدی نورسی، نموونەیەکی عەقڵیی هێناوەتەوە، تێیدا پیشانی دەدات کە مەحاڵە ماددەیەکی زیندووی دژە ژەهر بە هەندێک ڕێگای زۆر وردبین و هاوسەنگییەکی گونجاو و بەڕێکەوت لە ئەنجامی زەمینلەرزەیەک لە دەرمانخانەیەکی پڕ لە شووشەی مادەی شل و ماددەی پزیشکی و ماددەی کیمیاویی جۆراوجۆر دروست ببێت، جا بە هۆکاری ئەم زەمینلەرزەیە ئەم ماددانە برژێن و بە هەندێک بڕی دیاریکراو و هاوسەنگییەکی گونجاو تێکەڵ ببن و ماددەیەکی دژە ژەهرییان لێ پێک بێت. بەشێوەیەک کە ئەگەر بەشێک لە گرامێک لەم بڕە کەم و زیاد

بووایە، ئەو ماددەیە نەدەبوو و بەکەڵک نەدەهات. مامۆستا نوورسی لەبارەی ئەم نموونەیە دەڵێت: "هەر بوونەوەرێکی زیندوو، پێکهاتەیەکی زیندووە، هەر ڕوەکێکیش وەک ماددەیەکی زیندەیی دژە ژەهرییە کە لە بەشی جیا جیا و ماددەی دیاریکراو پێکدێت بەپێی سەنگ و بڕی ورد و هەستیار. جا گومانی تێدا نییە گەڕاندنەوەی ئافراندنی ئەم بوونەوەرە گەورەیە بۆ هۆکاری ماددی و وتنی ئەوەی هۆکارەکان گەردوونیان دروست کردووە، قسەسەکی بەتاڵە و مەحاڵە، زۆریش دوورە لە هاوسەنگیی مێشک وەک بەتاڵی و مەحاڵیی پێکهاتەی دەرمانێکی زیندەیی دژە ژەهر لەخۆیەوە و لە ئەنجامی ڕژانی هەندێک ماددەی شلەوە."[1]

لە ڕێگەی ئەم ڕوونکردنەوەیەی نوورسی، دەبینین مەبەستی ئەوەیە هەروەک چۆن مەحاڵە پێکهاتەیەکی زیندەیی دروست بێت، ئاواش مەحاڵە زیندەوەر بە هۆکاری ماددییەوە دروست ببن. واتە ئەگەر مێشک ڕەتی کردەوە کە ماددەیەکی زیندوو لەخۆیەوە دروست ببێت، ئەوا ئەوەش ڕەت دەکاتەوە کە هۆکاری ماددی بوونەوەری زیندووی دروستکردبێت.

مەحاڵی دووەم: بۆئەوەی وا لە هۆکاری ماددی بکەیت تا ببنە هۆکاری سەرەکی لە دروستکردنی شتەکان و ئافراندنی بوونەوەردا، ئەوا پێویستە هەموو هۆکارێکی لێکچوو و جیاواز و تەنانەت دژیەکیش بە شێوەیەکی ڕێکخراو لە دروستبوونی بوونەوەرێکی زیندوودا کۆبکەیتەوە. عەقڵیش ئەوە ڕەت دەکاتەوە و بە شتێکی مەحاڵی دادەنێت، چونکە «کۆبوونەوەی هۆکاری جیاواز و دژیەک، بە ڕێکخستنێکی تەواو و هاوسەنگییەکی ورد و بەڕێکەوت لە لەشی بوونەوەرێکی بچووکدا -بۆ نموونە، مێش- شتێکی مەحاڵە، ئەگەر کەسێک هێندەی باڵی مێشێک مێشکی هەبێت، دەزانێت ئەوە مەحاڵە.»

---

(١) بەڕتووکی: رسائل النور- اللمعات، سعيد النورسي: (٢٤٨- ٢٤٩).

بەم جۆرە ئەگەر مێشک کۆبوونەوەی هۆکارە دژیەکەکانی بە مەحاڵ دانا، ئەوا ئەوەش بە مەحاڵ دادەنێت کە ئەم هۆکارە ژیان لە بوونەوەراندا دروست بکات و ڕێکی بخات.

مەحاڵی سێیەم: ئەم گەردوونە دەقیق و هاوسەنگ و ڕێکخراوە کە زۆر بە وردبینی دروستکراوە، پێویستە لەلایەن یەکێکەوە دروستکرابێت کە توانای تەواوی هەبێت. مەحاڵە عەقڵ ئافراندنی ئەم گەردوونە بۆ «هۆکاری سروشتیی کەڕ، کوێر، لاڵ، بێگیان و ناڕێکخراو» بگەڕێنێتەوە کە نە هەستی هەبێت، نە مێشک. ئەمە دوورە لە هەموو پێوەرێکی عەقڵی.

دەبینین کە ئەم سێ مەحاڵە، مەحاڵی عەقڵی و واقیعین، واتە عەقڵ و واقیعیش ڕەتی دەکەنەوە. ئەو وەڵامانەی بۆ شەکی «هۆکارە ماددیەکان دروستی کردووە» و ئەو گومانکارییە لەناو دەبات، ئەم سێ مەحاڵە پێکەوە لە ڕێکخستنێکی زنجیرەیی گرێدراو بە فیکری فەلسەفی قووڵدان، هەر مەحاڵێک بەرانبەر لایەنێکی دیاریکراو وەستایەوە. مەحاڵی یەکەم بەرانبەر گریمانەی بەڕێکەوت دروستبوونی هەبوون وەستایەوە. مەحاڵی دووەم بەرانبەر گریمانەی هۆکاری لای ڕێبازە ماددیگەرییەکان وەستایەوە. مەحاڵی سێیەمیش «زۆری»ی لەناو سروشتدا لەناوبرد، واتە ئەو کاتەی هۆکارەکان زۆر بن، ئەو زۆرانە کەسێک پێکی دەهێنێت.[1]

---

(١) بەڕتووکی: المحاججة العقلية في برهنة حقائق القرآن ....، د. آمـاد كاظم: (٨٨).

## گریمانەی سێیەم: گەردوون لەخۆیەوە پەیدابووە!

مەبەست لەمە ئەوەیە کە شتێک لەخۆیەوە پەیدابوبێت، خۆی خۆی دەئافرێنێت تا دەگاتە وێنەی کۆتایی خۆی. لەکارخستی ئەم قسەیە بەپێی زۆر لە مەحاڵەکان ناشاردرێتەوە. مامۆستا نوورسی لە سێ مەحاڵدا کۆیکردوونەتەوە:

مەحاڵی یەکەم: مامۆستا نوورسی گریمانەی لەخۆوە پەیدابوونی شتێکی بە ڕێگای بەراوردکردنی لەشی مرۆڤ لەگەڵ کارگەیەکی گەورە کە بەردەوام نوێترین ئامێری هەن و بەپێی جووڵەی ڕێکخراوی پیلان بۆ دارێژراوی، پووچەڵ کردووەتەوە. دەڵێت کە هەر گەردیلەیەک و خانەیەک لە لەشی مرۆڤدا بەبەردەوامی و بێ ڕاوەستان بە کاری خۆیان هەڵدەستن. هەریەکەیشیان گرێدراون بە پەیوەندییەکانی بوون لە گەردووندا، بەهۆی ئەوەی هەریەکەیان لە بارودۆخی پێدان و وەرگرتنن لە ڕزق و مانەوە لەگەڵ بوونەوەرانی تردا.[1]

ئەوە بەڵگەیەکی واقیعیی دیارە لەبارەی مەحاڵیی گریمانەی «دروستبوونی شتەکان لە ماددەی بێگیان کە نوێ نەبێتەوە و نەگۆڕدرێت». بەم جۆرە مامۆستا نوورسی گریمانەی گۆڕان و نەگۆڕانی ئەوانی دانا لەو بوونەوەرانەی کە ئاماژەن بۆ بوونی خودایەکی تاقانە و خودایەتی و پەرستن لە هەموو گەردووندا.

مەحاڵی دووەم: گەڕاندنەوەی ئافراندنی بوونەوەری ڕێکخراو بۆ خانەکانی و گەڕاندنەوەی ئافراندنی گەردوون بۆ گەردیلەکان پێویستی بەوە هەیە کە هەر گەردیلە و خانەیەک مێشکێکی گەورەی هەبێت هەریەکێکیشیان دەسەڵاتێکی ڕەهای بەسەر خانە و گەردیلەکانییەوە هەبێت و لە هەمان کاتیشدا لەژێر دەسەڵاتی ئەواندا بن، پێویستیشە هەر یەک لەمانە دواکەوتووی بێت و جووڵە

---

(١) پەڕتووکی: رسائل النور- اللمعات، سعيد النورسي: (٢٥١).

و ویستێکی ئازادی هەبێت و لە هەمان کاتدا گرێدراویش بێت. ئەمەش لە واقیعدا دژیەکە و بەپێی مێشکی ساخلەمیشەوە مەحاڵە.

بەم جۆرە گریمانەی لەخۆوە دروستبوونی لە گەردیلە و پێکهاتنی لەش لە خانەکان لەناوبردرا و سەلمێنرا کە ئافراندووی ڕێکخراو جێدەستێکە لە جێدەستی خودای هەمیشە هەبووی تاقانە.[1]

مەحاڵی سێیەم: ئەگەر هەبوونی مرۆڤ و ژیانی مرۆڤ نە بە پێنووسی خودای تاک و تەنیا بێت، نە بە دادپەروەریی ئەو بێت، بەڵکوو بەهۆی کۆبوونەوەی سروشت لەگەڵ هۆکارەکان دروست ببێت و ژیانی بە چاپخانە سروشتییەکان نووسرابێت، ئەوا لەو کاتەدا پێویستە قالبە سروشتییەکان بە ڕێژەی هەزاران هەزار ئەو پێکهاتە ڕێکخراوانە هەبن کە لە لەشتدا کاردەکەن. بە شێوەیەک کە بێشومار بن و نەژمێردرێن، هەر لە بچووکترین خانە، ئەوەی بە وردبین کاردەکات هەتا گەورەترین ئەو ئامێرانەی تێدا کار دەکەن. تەنانەت لە بارودۆخێکی ئاواشدا، ئەرێ بۆ دروستکردنی ئەو پێنووس و قاڵب و پیتانەی هەن، پێویست نییە هێندە پێنووس و قالب و پیت و پێنووسی تر هەبن بۆ دروستکردنی ئەوانی تر ئەگەر هەموویان بۆ یەک پێنووس نەگەڕێنرانەوە؟ ئەوەش لەبەئەوەی هەموویان نوێن و ڕێکخراون و دروستکەرێکیان نییە دروستیان بکات، کەسێکیش نییە نوێیان بکاتەوە. بەم جۆرە تا قووڵتر بچیتە ناوییەوە، ئەوا ئەمە و زۆر مەحاڵی تری عەقڵی لەخۆ دەگرێت.

لەو سێ مەحاڵەی باسمان کردن، تەنیا نموونەمان لەسەر لەشی مرۆڤ هێنایەوە، چونکە شتێکی ئاشنایە بۆ مرۆڤ و بۆ ڕوونکردنەوە و تێگەیشتنیش ئاسانترە.[2]

---

(١) بەڕتووکی: المحاججة العقلية في برهنة حقائق القرآن ...، د. آماد كاظم: (٨٩).

(٢) بەڕتووکی: المحاججة العقلية في برهنة حقائق القرآن ...، د. آماد كاظم: (٩٠).

## گریمانەی چوارەم: سروشت ئەوەی ویستووە!

ئەم شەکە لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە بڵاوبوویەوە و هەندێک لە شارەزایانی زانستی ماددیگەرایی لەپشتییەوە بوون، بوونی شتەکان و ڕووداوەکانیان بە سروشتەوە گرێ دەدا و دەیانوت: سروشت شتەکان دروست دەکات و دەئافرێنێت. ئەمەش هەڵەیەکی خراپە، چونکە لەسەر سێ مەحاڵ بنیات نراوە:

مەحاڵی یەکەم: ڕێکوپێکی و دروستبوونی بوون کە بە بەرچاوڕوونی و شارەزایی و کاربەجێیی وەسف دەکرێت و لە بوونەوەران و شتی هەبوودا دیاردەبێت، پاڵدانی ئەمانە بۆ سروشتێکی بێگیان ئەوە دەخوازێت کە سروشتی ماددی چەندین چاپخانەی هەبێت و زۆر ئامێری مەعنەویی بێشوماری هەبێت و لە هەموو شتەکاندا توانای پێویست لەسەر کرداری ڕوودان و ئافراندن دەرباز دەکات. بۆ نموونە، ئەگەر ڕەنگدانەوەی ڕۆژ لەسەر دڵۆپە ئاوە بریسکاوەکان یان پارچە شیشەکان پاڵپشتیکراو نەبێت و نەڵێین کە ئەوە خۆرە لە ئەواندا ڕەنگ دەداتەوە، ئەوا ناچارین بڵێین ئەم دڵۆپە ئاو و پارچە شووشانە خۆیان ئەو ڕووناکییە دەبەخشن، ئەوەش دیارە کە هەڵەیە و مەحاڵێکی عەقڵییە. بە هەمان شێوە ئەگەر هەموو شتە ئافرێنراوەکان بۆ ئافرێنەر نەگەڕێنینەوە، ناچارین بڵێین سروشت بە هێزی ڕەهای خۆی ئەم دروستکراوانەی دروست کردووە. هێزی ڕەهای سروشتیش شتێکە کە عەقڵ مەحاڵی دەکات، هەر وەک چۆن ڕووناکیدانەوەی تەنە ڕوونەکان بە سەرچاوەی ڕووناکیی تر ڕەت دەکاتەوە.

مەحاڵی دووەم: عەقل گەڕاندنەوەی ئافرێنراو بۆ سروشت بە شتێکی مەحاڵ دەزانێت. واتە عەقڵ ئەوە مەحاڵ دەکات هەندێک خاکی کەم ئافرێنەری گوڵ بێت. جا ئەوەی باوەڕی وایە کە سروشت شتی هێناوەتە بوون و گەشە بە گوڵ دەکات، ئەوکات پێویستە بیر لەو خاکە بکاتەوە کە وەک سیفەتێکی ئافراندن و داهێنانکاری و گونجاندن و هاوسەنگییە. بەم جۆرە ئەم خاکە خۆی خوای

ئافرێنەرە و ئافرێنەری ئەو گوڵانەیە، دواتر لەسەر ئەوە هەموو گوڵەکانی جیهان بێنێتە بوون، بە ڕەنگ و بۆنە جیاوازەکانییەوە، خاوەنی سروشت ناچار دەکات باوەڕ بە هەستی هونەری و جوانی ئەو کارانەی خاک بکات، ئەوەش ڕێگرە لەوەی عەقڵ باوەڕ بەوە بکات.

مەحاڵی سێیەم: ناوەڕۆکەکەی لەوەدا کورتکراوەتەوە کە خودایەتیی سروشت، ئەوەی کە کەسانی ماددی پشتی پێ دەبەستن تەنیا خەیاڵە و هیچ ڕاستییەکی بۆ نییە و بەڵگەیەکیشی نییە. ئەگەر هەر پێویستی بەوە هەبێت کە سروشت خاوەن بوونێکی تەواو و دەرەکی بێت، ئەوکات ئەوە بوونە. نوورسی دەفەرمووێت: "بوون لە ئافراندن و دروستکراوی ئافرێنەرێکە و خۆی نابێتە ئافرێنەر، ئەو نیگارە و نابێتە نیگارکێش، کۆمەڵێک یاسان و نابنە حاکم، شەریعەتێکی خواڕسکە و نابێتە دانەری شەریعەت."[1]

لە ئەوەی ڕابردوودا تێدەگەین کە پێویستە بەڵگەی عەقڵی لە پەڕتووکە کەلامناسییەکاندا وەربگرین بۆ بەڵگەهێنانەوە لەسەر هەبوونی خودا و تاقانەیی ئەو، هەروەها بۆ لەکارخستنی ئەوەی کە ئافرێنراو و بوون بۆ سروشت و هۆکارەکان بگەڕێنەوە. لە هەموو مەحاڵەکانی پێشوودا ئاماژە بەو بەهانانەی گفتوگۆ دران کە بەرانبەر ناچار دەکەن و گومانەکانی لەناو دەبەن. هەروەها پێوەری لۆژیکی بەکارهێنران وەک پێوەری (قياس الأولى) و «پێوەری نائامەدەیی نوێنەر»(قياس الغائب التمثيلي) و پێوەری باکگراوند (قياس الخلف).

بەم جۆرە بانگخوازانی سەردەم دەتوانن سوود لە ڕێبازی گفتوگۆی عەقڵی و فەلسەفی ببینن و بەکارهێنانی بەڵگە ڕوونەکانی لە بەهانەی بەڵگەیی (الحجة البرهانية) و بەهانەی گفتوگۆیی (الحجة الجدلية)، پێوەری لۆژیکی،

---

(١) پەڕتووکی: رسائل النور- اللمعات، سعيد النورسي: (٢٥٤).

پێوەری ئوسووڵی؛ هەموو ئەو پێوەرانە بەکاربێنن کە بە شێوەیەکی گونجاو لەگەڵ ڕۆحی سەردەمن و پێویستییەکانی بەرانبەرەکەی پەیدا دەکەن.[١]

(١) پەڕتووکی: المحاججة العقلية في برهنة حقائق القرآن ...، د. آمـاد كاظم: (٩١ — ٩٢).

# بەشی پێنجەم

## هەڵەی فیکری نوێخوازی لەبارەی دەقەکانی سرووش (وحي)

لە ڕێگای خوێندنەوەی فیکری نوێخوازی (الفكر الحداثي) دەربارەی سرووش (وحي)، بینیمان کە بیرمەندانی فیکری نوێخوازی لە ڕۆژئاوا ڕاستی و دروستی سرووش ڕەت دەکەنەوە، ئەمەش بەهۆی ئەو هەموو ئەفسانانەی لە پەڕتووکە ئایینییە پیرۆزەکاندا بینراون، سەرەڕای دژایەتی کەنیسە بۆ زانست و زاناکان.

سیکیۆلاریزمە عەرەبەکان هاتن ئەم بیرکردنەوەیان لەسەر قورئانیش جێبەجێ کرد، بێ ئەوەی جیاوازیی لەنێوان واقیعی ڕۆژئاوا و واقیعی جیهانی ئیسلامیدا بکەن، بێ ئەوەی جیاوازی لەنێوان قورئانی پارێزراو و پەڕتووکە گۆڕدراوەکانی تری ئاسمانی بکەن، هەروەها بێ ئەوەی گونجان و چۆنیەتیی قورئان لەگەڵ زانستدا ڕەچاو بکەن.[1] یان بێ ئەوەی جیاوازی بخەنە نێوان بەهادان بە زانست

---

(١) زۆر لە زاناکانی ڕۆژئاوا گەواهی بۆ زانستی قورئان دەدەن، لەوانە: فەیلەسووف و مێژوونووسی فەڕەنسی «غوستاف لوبون» لە پەڕتووکەکەیدا دانی ناوە بە قەدر و بەهای شارستانییەتی ئیسلام لە ڕۆژئاوا. زۆر زانای تریش دانیان بەوە داناوە، وەک: پزیشکی فەڕەنسی «موریس بوکای»، بە بەڵگەی زانستی ڕاستی قورئانی سەلماندووە، ئەوەش کاتێک لە کتێبەکەیدا بە ناوی (التوراة والإنجيل والقرآن والعلم الحديث) سەلماندوویەتی کە ڕاستییە زانستیی و دۆزینەوە هاوچەرخەکان گونجاون لەگەڵ قورئانی پیرۆز. لەوانەش دکتۆر «کیث مور»، مامۆستای زانستی توێکاری لە زانکۆی تۆرینتۆ لە کەنادا بەوە بەناوبانگ بوو کاتێک ئەوەی دۆزییەوە کە ئەو ئایەتانەی قورئان کە پەیوەندییان بە زانستی کۆرپەلەزانییەوە هەیە، بەڵگەکانی قورئان لە بارەی ڕاستیی بنەما و قۆناغەکانی کۆرپەلە وەک خۆی پشتڕاست دەکەنەوە. بۆ ئەمەش وتارێکی لە گۆڤاری:

لەلایەن قورئانەوە و گرنگیدانی قورئان بە عەقڵ بەرانبەر ئەو مامەڵەیەی کەنیسە لەگەڵ زانست و زانایانی ئەنجام داوە.[١]

بەم جۆرە زۆر هەڵەمان لە بیری بیرمەندانی نوێخوازە عەرەبەکاندا بینی، لەوانەش:

## بەمێژووییکردنی دەقی ئایینی

مەبەست لە زاراوەی «بەمێژووییکردنی دەقی ئایینی»، واتە دەقی ئایین و سوننەت دەقی مێژوویین و پیرۆزییەکیان نییە. ئەم بۆچوونە بەرهەمی هزری ڕێبازی نوێخوازییە، ئەوەی لەسەر هزری ڕێژەییەتیی ڕاستی و ڕەتکردنەوەی پیرۆزی و شتی وەرگیراو لە کولتوورەوە بنیاتنراوە. ئەمەش دەکەنە ڕێگایەک بۆ بڕینی ئەو پەیوەندییەی نێوان سرووش (وحي) و واقیعی هاوچەرخ. دەڵێن ئەوە گونجاوترە لەگەڵ پێویستییە هاوچەرخەکان، هەروەها هەوڵی ڕێگای بڵاوکردنەوەی شەک و گومانەکان دەدەن لەسەر سەرچاوەی قورئان، تا بتوانن خەڵک بخەڵەتێنن بەوەی قورئان تەنیا ئاخاوتنی مرۆڤێکە، تەنیا وەک دەقێکی مێژوویی ڕێزی لێ دەگرین و هیچ پیرۆزییەکی نییە. وا دەری دەخەن کە هیچ پێویست نییە ئێمە بەدواداچوون بۆ قورئان بکەین و پێگیری بە حەڵاڵ و

---

(The Journal of the Islamic Medical Association, Jan-June ١٩٨٦, Vol.١٨) بڵاوکردەوە و بە بەڵگەی زانستی سەلماندی کە ئەوەی قورئان دەیڵێت سەبارەت بە پەرەسەندنی کۆرپەلە بەشێوەیەکی ئاشکرا ڕاستیی قورئان و بوونی خودا نیشان دەدات.

(١) لەنێوان ساڵانی (١٤٨١) تا ساڵی (١٤٩٩) زایینی، دەسەڵاتدارانی کەنیسە زانای زۆریان دادگایی کرد، چونکە هزری زانستییان پێچەوانەی کەنیسە بوون. دواتر بە سەدان پەڕتووکی زانستییان سووتاندن بە بیانووی دژایەتییان لەگەڵ کەنیسە. بۆ زانیاری زیاتر سەیری پەڕتووکی: (أثر الكنيسة في الفكر الأوروبي)، د/أحمد علي، بکەن.

حەرامەوە بکەین، بەڵکوو پێویستە خۆمان یاسای ڕەوشتی دابنێین. ئەو ڕێبازە باسی مێژووی دەقەکان دەکات و دەقە ئایینییەکان بە شتێکی کۆنە دەبینن.

ئەوانە چەندین ئامانجیان هەیە، لەوانەش:

- بەمێژووییکردنی سوننەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) واتە دەیانەوێت سوننەت بکەنە ڕێبازێکی مێژوویی. بەپێی ئەوان بێت، فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) تەنیا وتەی مێژوویین و زیاتر نا.

- بەمێژووییکردنی هزری ئیسلامی، (واتە گرێدانی فیکری ئیسلامی بە واقیعی مێژووی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییەوە ...). مەبەستیانە هزری ئیسلامی بکەنە مژارێکی مێژوویی کە پێویستە لەبیربکرێت و نابێت لە کۆمەڵگەی سەردەمدا نوێبکرێتەوە.

- بەمێژووییکردنی شەریعەت و تەفسیری قورئان: واتە باکگراوندی مێژوویی بە هەموو پێکهاتە ڕۆشنبیرییەکانییەوە کەوتووەتە بەرانبەر مێشکی شرۆڤەکارێک لە مامەڵەکردنیدا لەگەڵ ئەحکامەکاندا. بەم جۆرە، پیشانی خڵکییان دا کە قورئان و سوننەت و شەریعەت کولتوورێکی مێژوویین و پێویستە لاببرێن، ئینجا پێویستە دوای سیستمی نوێخوازیی ڕۆژئاوا بکەوین لەبارەی باوەڕ و بەها ڕەوشتییەکانەوە.

جا لای ئەو ڕێبازە وا باو بوو کە مێژووی گرێدراو بە دەقی ئایینییەوە، مانای بەستنەوەیەتی بەو ساتە مێژووییەی کە تێیدا دەرکەوتووە، لەبەر ئەمەشە کە دەقی قورئان و سوننەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) بەکەڵکی هەموو کات و شوێنێک نایەت لە تێڕوانینی ئەواندا.

## بەمێژوویيکردنی دەقی ئایینی لای موحەممەد ئەرگوونیی بیرمەند

یەکێک لە دیارترین کەسایەتی ئەم سەدەیەمان کە باسی بەمێژوویيکردنی دەقی ئایینی کردبێت، موحەممەد ئەرگوونی جەزائیرییە، ئەوەی لای پشتیوانەکانی لە بیرمەند و نوێخوازانی ئەم سەردەمە دەژمێردرێت. زۆر نووسینی لەم بوارەدا هەیە و پێی وایە کە قورئانی پیرۆز پەرتووکێکی مێژووییە و هەندێک بۆچوونی تایبەتیشی هەیە بۆ شیکارکردنی زاراوەی وەحی.[1] بانگەشەی ئەوە دەکات کە ئەحکام و بڕیارەکانی قورئان ڕێژەیین و لای دەسەڵاتی جێبەجێکردنەوە ڕاستیی ڕەها و بنەمای ڕەهایی ڕەوشت هەڵناگرێت.

بۆیە ئەرگوونی -بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ- هەموو بنچینەکانی باوەڕ و ئایینی ڕەتدەکردنەوە. هەر لە بنەماکانی شرۆڤەکردن و بنەما ئوسولییەکان، هەتا ڕەتکردنەوەی تێگەیشتنی هاوەڵان و موفەسیرانی قورئان و هەموو زانایانی شەریعەت. ئەو دەڵێت: تێگەیشتنی کەسیی ئاواکراو لەسەر لێکۆڵینەوە زانستییەکان بەسن بۆ تێگەیشتن لە دەقی قورئان و هیچ پێویست بە تەفسیر و زمانی ڕێزمانی نییە.[2] هەروەها بانگەشەی ئەوە دەکات کە قورئان تەنیا ڕاستییەکی مێژووییە و جێی ڕەزامەندیی زۆربەی مرۆڤەکان نییە. پێی وایە زۆر پێویستە سوننەت و قسەی هاوەڵان و مەزهەبی فیقهی و پەرتووکەکانی تەفسیر لەناوببردرێن و لاببرێن.[3]

بەم جۆرە، ڕوونە کە ئەرگوون وا بیردەکاتەوە و بانگەشەی ئەوە دەکات کە قورئان دەقێکی مێژووییە، بە شێوازێکی تایبەت و بۆ کۆمەڵگەیەکی تایبەت هاتووەتە خوارەوە، جا باسەکە گرێدراوە بە تایبەتبوونی بابەت و سەرجەم ئەو

---

(١) تاريخية الفكر العربي الإسلامي، محمد اركون: (١٠).

(٢) القرآن من التفسير الموروث إلى تحليل الخطاب الديني، محمد أركون: (٨٥).

(٣) القراءة الأركونية للقرآن ، احمد فاضل السعدي: (١٢٧ - ١٣١).

ڕووداو و بەسەرهاتانەی لە کاتی هاتنەخوارەوەی ئەودا هەبوونە، نەک بە درێژبوونەوە و گشتیبوونی باسەکە بۆ ئێستا. ئا لێرەدا ئەرگوون دژیەکە لەگەڵ بنەماکانی کەلامناسی و ئوسوولی، کاتێک دەڵێت: "العبرة بعموم اللفظ لا بخصوص السبب."[1] واتە: "بەسەرهات بەپێی گشتیبوونی ئاخاوتنە، نەک بەپێی تایبەتبوونی هۆکار."

ئەگەرقورئانی پیرۆزمان بە کاتی ڕابردووەوە بەستەوە -وەک ئەرگوون بانگەشەی بۆ دەکات-، ئەوکات خەسڵەتی نێردرانی بۆ هەموو مرۆڤایەتی، لەدەست دەدات. ئەوەش دژیکە لەگەڵ فەرمایشتی خوای گەورە:

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَـٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَـٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ [2] «بەڕاستی تۆمان نەناردووە بۆ ئەوە نەبێت ببیتە موژدەدەر و ترسێنەر بۆ هەموو خەڵکی، بەڵام زۆربەی خەڵکی نایزانن.»

ئەم فیکرەیەی «بەمێژوویکردنی دەقی ئایینی» بەگشتی و فیکری موحەممەد ئەرگوون بەتایبەتی، هەوڵدانە بۆ نەهێشتنی «بەها ڕەوشتییە ڕەهاکان» و چەسپاندنی «بەها ڕێژەییەکان»، کە بتوانرێت بەپێی ویست و بەرژەوەندیی ئایدیۆلۆژی و سیاسی بگۆڕدرێن. ئەوەش بەرهەمی «سەفسەتەی عیندی»یە[3] کە کرۆکی نوێخوازییە، وەک لە بەشی یەکەم و دووەمدا ئاماژەمان پێی دا.

---

(١) ارشاد الفحول، الشوكاني: (١١٧). والوجيز في اصول الفقه، عبد الكريم زيدان: (٣٢٤).

(٢) سورة السبأ: (٢٨).

(٣) سەفسەتە (بەهەڵەدابردنی)ی عیندی: واتە «بە لای منە»، واتە بڕیاردان لەسەر شتەکان بەپێی تێڕوانینی خۆت، نەک مەبەست و ئەسڵی بابەتەکە. (وەرگێڕ)

## هەڵوەشاندنەوەی دیدی نوێخوازی بۆ بەمێژووییکردنی وەحی

دوای ئەوەی بەگشتی سەیری ڕێبازە نوێخوازییە عەرەبییەکانمان کرد و بەتایبەتییش لە دیراسەکردنی قورئاندا، بینیمان کە دیراسەکردن و شیکارکردنێکی هەڵەیە، دوورە لە ڕێبازی زانستیی ئەکادیمی و سیستەمێکی تێکەڵیە لەو ڕێبازانەی وەستاونەتەوە سەر «ڕێژەییبوونی ڕوون» (النسبية السائلة)، ئەوانەی لەخۆیانەوە ڕۆڵی نووسەر و مەبەستەکەی لە دەقدا ناهێڵن و دەسەڵات دەدەنە خوێنەر بەوەی چۆن بیانەوێت، ئاوا لە دەق تێبگەن، بێ ئەوەی گرنگی بە ڕێساکانی زمان یان ڕێزمان و ڕێکخستن بدەن. ئەمەش ئەوەیە کە ئێمەی گەیاندووەتە لەدەستدانی مەعریفە.

نوێخوازەکانی ڕۆژئاوا چەندین ڕێبازی نوێخوازییان بەرهەم هێنا، وەک: (البنيوية) و (الهيرمونوطيقية)، و (التفكيكية) و (التاريخانية)... هتد[١]. ئەو ڕێبازانەشیان لەسەر دەقی ئەدەبی و مێژوویی بەکاهێنان، بەڵام نوێخوازانی عەرەب ئەم ڕێبازانەیان بەسەر دەقی قورئاندا سەپاند. بەمەش فیکر و هزری هەڵەی لێ پەیدا دەبێت و لە ئەنجامی چوونە ناو هەندێک بابەت کە هیچی لێ نازانن و بێ ئەوەی زەحمەت بۆ خۆیان دروست بکەن و، لە پەڕتووکەکانی تەفسیر، ئیعجازەکانی قورئان، پەڕتووکەکانی ڕەوانبێژی و ڕێزمانی، خوێندنی (ديلالي)، ڕستەبەندی (السياق)، تیۆرییەکانی زمانی کۆن و هاوچەرخ[٢] بکۆڵنەوە و لەڕێگایانەوە تێبگەن.

لەبەرەوەی ئاشکرایە کە ناکرێت لە ئایەتەکانی وەحی و مەبەستەکانی بگەین بەبێ تێگەیشتنی پەیوەندیی وشەکانی پێکەوە، چونکە مانا و مەفهوومی هەر وشەیەک بە وشەیەکی ترەوە گرێدراوە لە ڕستە و سیاقی قسەکردندا.

---

(١) القرآءة الأركونية للقرآن، احمد فاضل السعدي: (١٣٤ - ١٣٥).

(٢) جدلية اعجاز النص القرآني - اعتراضات ومعالجات: الدكتور. آمـــاد كاظم و الدكتور: محمد ذنون: (٩٨- ٩٩).

مانای ئایەت پەیوەندیی بە هۆکاری هاتنەخوارەوەی ئایەت (سبب النزول) هەیە، هەروەها پەیوەندی بە کات و شوێنی هاتنەخوارەوەی هەیە، پەیوەندی بە هەڵکەوتەی حوکمی ئایەتەکە و ئەو کەسانەشەوە هەیە کە بەسەریاندا هاتووە خوارەوە. هەروەها پیشاندانی ڕۆڵی ئایەت لە ڕستەبەندی (السیاق) ی سوورەت و پەیوەندییەکەی لەگەڵ ئایەتەکانی پێش خۆی و دوای خۆی. سەرباری ئەوەش پێویستە بزانین تێگەیشتنی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) بۆ ئایەتەکە چی بووە و هاوەڵان چۆن کاریان پێ کردووە، هەروەها چۆن مەفهوومی ئایەت بۆ ڕووداو و کێشە سەردەمییەکان بەکاردێنین. ئەمانە هەمووی دەبێت لەبەرچاو بگیرێن، پێش ئەوەی ئایەتەکە شرۆڤە بکرێت، تاوەکوو بگەینە ڕاستیی مەبەستی ئایەتەکە.

لەوەی ڕابردوودا بۆمان دەردەکەوێت کە مانای ڕێزمانی ئەوەیە کە ماناکان پێکەوە گرێدەدات پێش ئەوەی وشەکان پێکەوە گرێبدات. لێرەدا دەردەکەوێت کە مانای ڕێزمانی زۆر فراوانترە لە مانای ئیعراب و شرۆڤەکردن. شرۆڤەکردن (اعراب) تەنیا بەشێکی گرنگە لە بەشەکانی مانای ڕێزمانی و ڕۆڵەکەی دوای پێکەوەگرێدانی وشەکانی هەر ڕستەیەک دێت. مانای ڕێزمانی شتێکی عەقڵیی زۆر گرنگە لە ڕێکخستندا و بنچینەی ڕێکخستنە، بەڵام شرۆڤەکردن (اعراب) شتێکی گرێدراوە بە ئاخاوتنەوە و تەواوکەری ڕوونکردنەوە و تێگەیشتنی مەبەستی ئاخاوتنە.

لەوەدا بۆمان دەردەکەوێت کە ناتوانین بەبێ ڕستەبەندی مانا لە هەمان ئاخاوتن دروست بکەین، بەڵکوو پێویستە بیخەینە ڕستەبەندییەکی دیاریکراوەوە، پاشان ڕێکخستن بکەین لەنێوان مانای ئەو ڕستەیە و وشەکانی ماوە، بەپێی بنەمای مەبەستەکانی ڕەوانبێژیی داواکراو لە شێوازی: پێشخستن و پاشخستن، لێککردنەوە و گەیاندن، کورتکردنەوە و تێروتەسەلی و زۆر شێوازی تر، ئەمەش لەبەرەوەی مانا بەپێی ڕێکخستنی وشەکانی ڕستە مەبەستدارە و ئاخاوتن تەنیا

ڕێگەیەکە بۆ ڕوونکردنەوەی.

ئینجا خوێندنەوەی نوێخوازی بۆ ئایەتەکان لە ڕێگەی بەمێژوویکردنیاندا خوێندنەوەیەکی ڕووکەشییە، ناچێتە ناو قووڵایی و بەرفرەیی و ڕەوانبێژییەکەی لە پێکەوەگرێدانی وشەکان لە ڕستەسازیدا، هەروەها هەر یەکەیان بە ئەوەی ترەوە گرێ نادات، چونکە هەندێک خوێندنەوە و دیراسەی بەش بەشکراون کە دەبێتە هۆکار بۆ گۆڕینی مەبەستی ئایەت و ماناکەی. بۆیە پێویستە ئەم پێکەوەگرێدانەی وشەکان لە ڕستەسازییەکەیدا بزانرێت، هەروەها پێویستە کاریگەریی «ڕێزمانی» و مەفهومی «دیلالی» لە ڕستەبەندیدا و پێشبینی هەڵوێستی کۆمەڵگا و ئەو کەسانە بزانرێت کە گفتوگۆیان لەگەڵ دەکرێت. دواتر پێویستە پەیوەندییەکانی پێکهاتە زمانییەکانی جیاکراوە و پێکەوەگرێدراوی بە هۆکارە ناوخۆی و دەرەکییەکانی بزانرێت، لەو کاتەی ئەو کردارە هەستیارانەی حیکمەتی دەق و ئایەت و وردەکاری دانراو و سیستەمکردوو و قووڵایی پێکهاتەکەی ئاشکرا دەکرێت بۆ گەیشتن بە مانا و مەبەستی دەقی ئایەکەتە.

# بەشی شەشەم
# هەڵە هزرییەکان و لۆژیکی ماددی

پەڕتووک و وتاری زۆر لەبارەی هەڵەی لۆژیکی هەن، بەڵام تێبینی من لەسەر ئەو پەڕتووکانە ئەوەیە کە هەموویان باسی هەڵەی هزری دەکەن، یان باسی هەندێک هەڵەی ماددیگەرایی دەکەن و دەڵێن ئەمانە: "هەڵەی لۆژیکین." ئەمە لەکاتێکدا کەوا بەڕاستی لە زانستی لۆژیکدا جیاوازییەکی گەورە هەیە لەنێوان وێناکردنی پێوان (صورة القیاس) و ماددەی پێوان (مادة القیاس)دا. بۆیە ئەگەر هەڵە لە وێناکردنی پێواندا هەبێت، ئەوکات دەبێتە «هەڵەی لۆژیکی» بەڵام ئەگەر هەڵە لە ماددەی پێواندا هەبێت، ئەوکات پێی دەڵێن «هەڵەی هزری» یان هەندێک پێی دەڵێن: «هەڵەی ماددی لۆژیکی»، بۆیە لێرەدا باسی هەڵە هزرییەکان و هەڵە ماددییەکان دەکەین.

هەندێک لێکۆڵەر و لۆژیکناس، لۆژیک دەکەن بە دوو بەشی سەرەکی:

١- لوژیکی وێناکردن (المنطق الصوري)

٢- لوژیکی ماددی (المنطق المادي)

هەندێک لێکۆلەری تر دەیکەن بە چوار بەش:

لۆژیکی وێناکرن، لۆژیکی ماددی، لۆژیکێ بیرکاری و لۆژیکی هێمایی (المنطق الرمزي)

هەندێک لێکۆلەری تریش بەشەکانی زیاتر دەکەن و بە هەندێک شێوازی

تری جیاواز دابەشی دەکەن.

بەڵام لۆژیکی وێناکردن (المنطق الصوري) لۆژیکی سەرکی و ڕەسەنە.

لەم بەشەدا؛ باسی هەندێک هەڵەی هزری و هەڵەی لۆژیکی ماددیی بەربڵاو دەکەین.

## یەکەم: گشتگیرکردنی بابەتێکی تایبەت بەبێ بەڵگە

لێرەدا بابەتێکی تایبەت بەبێ بەڵگە گشتگیر کراوە. بۆ نموونە مارکس (Karl Marx) لە گریمانەی بوونی ئایینەکاندا دەڵێت: "دروستبوونی ئایینەکان بۆ ئەو کاتە دەگەڕێتەوە کە چینی ئۆرستۆکرات و بۆرژوازی (ئاغا و دەرەبەگ و پیاوانی ئایینی) دەیانویست بەسەر هەژار و بێدەسەڵاتەکانەوە زاڵ ببن، جا هەستان ئایینێکیان دروست کرد و پێیان وتن: ئەم ئایینە ئێمەی کردووەتە بەرپرس و مەزن و ئێوەیشی کردووەتە بەندە و هەژار."[1]

هەروەها بەپێی هزری مارکس، بەها ڕەوشتییەکان هەموویان ڕێژەیین و هیچ بنەمایەکیان نییە، ئەوە تەنیا خەڵەتاندنێکە لەلایەن ئاغا و بەرپرس وسەرکردەکانەوە تا حوکم بەسەر هەژار و بێدەسەڵاتەکانەوە بکەن.

بەڵام نیچە (Friedrich Nietzsche) پێچەوانەی ئەوە دەڵێت: "چینی هەژار و بێدەسەڵات لەبەر زۆرداریی زۆردار و دەسەڵاتدارەکان بەسەریانەوە ئایینێکیان بۆخۆیان دروستکرد تا یەکسانی لەنێوان مرۆڤەکاندا بکات."[2] واتە بەپێی گریمانەی نیچە، هەژارەکان ئایینیان دروستکردووە تا لەژێر ستەمکاریی

---

(١) الموسوعة الفلسفية، لجنة من علماء السوفيت:)٨٩(. عقيدتنا في الخالق والنبوة:(١٢٦.

(٢) (نيتشه)، فصل أصنام الأخلاق. عبدالرحمن بدوي: (١٧١)، ما وراء الخير والشر، فريدريك نيتشه: (٢٢٨).

ستەمكاران دەركەون.

ئەگەر بێت و باوەڕ بە یەكێك لەم گریمانانە یان هەردووكیان بكەین، دەبینین كە هەردوو گریمانە دژیەكن! لەلایەك دەسەڵاتدارەكان ئایینیان دروست كردووە، تا هێزی خۆیان بەسەر هەژارەكان بسەپێنن؛ لە لایەكی تر و ژینگەیەكی تریشەوە هەژارەكان ئایینیان دروست كرد، تا لەژێر دەستی ستەمكاران ڕزگاریان بێت. هەرچەندە ئەم دوو گریمانەیە هەردووكیان دژیەكن، بەڵام تەنانەت ئەگەر ڕاستیش بن، ئەوا دەبێتە شتێكی تایبەت بە شوێنێك و واقیعێكی تایبەتەوە. جا بە چ پێوەرێك ئەم بۆچوونەیان بەسەر سەدەها میللەت و هەزارەها ناوچە گشتگیر كردووە؟! بە چی یاسایەكی لۆژیكی ئەوە دەكەن؟! چونكە بە سەدەها میللەت و هەزارەها شار و گوند دیندار بوونە، بەڵام بە شێوەیەكی تایبەت لە ڕێگای ئاغا و دەرەبەگ و هەژارەكانەوە نەبووە، بەڵكوو بەهۆی پێغەمبەرێكەوە باوەڕیان هێناوە، یان بەهۆی هەندێك موعجیزەوە، یانیش ئەمانەش هۆكار نەبوونە و هەندێك میللەت هەر خۆیان دیندار بوونە. تەنانەت گریمانەی «جیڤۆنسی»، گریمانەی «ماكس مولەر» و گریمانەی «دۆركایم»یش پێچەوانەی ئەم دوو گریمانانەن.

ئەم گریمانانە هەمووی دژیەكن، لەبەرەوەش ئەگەر دان بە یەكێكیشیاندا بنێین، هەڵەكی گەورەیە، چونكە هەر یەك لەو گریمانانە تایبەتە بە ژینگەیەكی دیاریكراوەوە و ناكرێت لەسەر هەموو جیهان گشتگیر بكرێت، یان بڵێین ئایینی هەموو میللەتان لەم ڕێگایەوە دروست بوونە. لە ڕاستیشدا ئەمە هەڵەیەكی زۆر گەورەیە.

## دووەم: تایبەتکردنی بابەتێکی گشتی بەبێ بەڵگە

ئەم جۆرە هەڵەیە پێچەوانەی هەڵەی یەکەمە، مەبەست لەم هەڵەیە ئەوە کە مرۆڤ شتێکی گشتی بێنێت و بەبێ بەڵگە تایبەتی بکات. بۆ نموونە، بنەمای خوارسکی (فیتری) بنەمایەکی گشتگیرە لە هەموو مرۆڤێکدا هەیە، ئەوەش بەپێی بەڵگەی واقیعی و لۆژیکی و فەلسەفی؛ بەڵام مولحیدان ئەم بنەمایە تایبەت دەکەن بە باوەڕدارانەوە و دەڵێن: "بنەمای فیتری تەنیا لای باوەڕدارە چاولێکەرەکانەوە هەیە." هەڵەکەشیان ئەوەیە کە بەبێ بەڵگە شتێکی گشتی و جیهانی تایبەت دەکەن بە هەندێک کەسەوە، چونکە نابێت مرۆڤ بەبێ بەڵگە شتێکی گشتی تایبەت بکات، بەپێچەوانەی بۆچوونەکەشیانەوە زۆر بەڵگەی فەلسەفی و مێژوویی و زانستی لەسەر گشتگیرکردنی بنەمای فیتری و خوارسکی لە مرۆڤدا هەن، لەوانەش:

### ١- بوونی خوارسکی (الفطرة) بەپێی فەلسەفە

قوتابخانەی فەلسەفەی عەقڵگەرایی سوقرات و ئەرستۆ و ئەفلاتوون و هەموو قوتابخانە عەقڵگەراییەکان، تەنانەت دیکارت و زانایانی (ثیۆلۆجی) و زانایانی کەلامناسییش؛ هەموویان بە شێوەیەکی لۆژیکی کۆکن لەسەر ئەوەی کاتێک منداڵ لەدایک دەبێت، کۆمەڵێک بنەمای فیتری و خوارسک لە مێشکیدا هەن. قوتابخانەی فەلسەفەی عەقڵگەرایی دەڵێت: "بنەما سەرەتاییە عەقڵییەکان، کە یەکێکیان یاسای هۆکارییە، هەر لە ساتی لەدایکبوونەوە لە مێشکی منداڵدا هەیە." واتای ئەم یاسایەش ئەوەیە کە هەر ڕووداوێک هۆکارێکی لەپشتەوەیە. بوونی گەردوون ڕووداوە و خودا هۆکاری ئەو ڕووداوەیە. لەبەرەوەش فەیلەسووفان دەڵێن: "بوونی خودا ڕاستییەکی ڕەها و بڕاوەیە، مەحاڵە عەقڵ بڵێت: خودا نییە. تەنانەت مەحاڵە بیریش لەوە بکاتەوە

کە خودا نییە، نەوەک بڕیاری نەبوونی بدات."[١]

## ٢- هەبوونی خواڕسکی (الفطرة) بەپێی زانست

لێکۆڵینەوە زانستییە نوێکان زۆر شتیان دۆزیوەتەوە کە پێویستە مرۆڤ بیریان لێ بکاتەوە، لەوانەش سەلماندنی خواڕسکیی زانینی هەبوونی خودا، ئەمەش بە شێوەیەکی گشتی و هەر لە دێر زەمانەوە و تا ئێستاش لای هەموو مرۆڤێکەوە هەبووە. بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەوەیە کە هیچ میللەتێک بێ ئایین نەبووە. زۆر لە زانایان پشتگیری ئەم بیرەیان کردووە، لەوانەش زانای زیندەوەرزانیی ئەمریکی «پۆل کلارنس ئەبرسولد» لە پەڕتووکی: (The Evidence of God in an Expanding Universe)دا باسی بەڵگەی خواڕسکیی کردووە و ئەوەی خستووەتە ڕوو کە هەموو مرۆڤەکان لەم هەستەدا هاوبەش و کۆکن. ئەو دەڵێت: "مرۆڤەکان بە جیاوازیی ئایین و ڕەگەز و وڵاتەکانیانەوە، بەگشتی و لە کۆندا زانیویانە کە مرۆڤ ناتوانێت ڕاستیی ئەم گەردوونە بەو بەرفرەیی و گەورەییەتییەوە بزانێت. هەروەها نەیانتوانیوە بگەن بە زانینی نهێنیی ژیان و سروشتەکەی لەم بوونەدا. ئەگەر بەدوای ئەو هۆکار و پاڵنەرانە بگەڕێین کە ڕووی ملیۆنان مرۆڤ دەدەنە باوەڕهێنان بە خودا، دەبینین جۆراوجۆرن و ئامار و هەژمار ناکرێن. ڕاستیش ئەوەیە کە بیری دروست و ساخلەم و پاک بوونی خودا لە عەقڵدا فەرز دەکات."[٢]

---

(١) پەڕتوکی: (قضايا فلسفية ..) د. سعد الدين صالح: (٢١١- ٢١٦)

(٢) پەڕتووکی: (The Evidence of God in an Expanding Universe) بۆ عەرەبییش وەرگێردراوە، لەژێر ناوی: (الله يتجلى في عصر العلم) پەڕتووکەکە لەلایەن کۆمەڵێک زانای ئەمریکییەوە نووسراوە. (٤١ - ٤٢).

## ٣- بوونی خوارسکی (الفطرة) بەپێی ئەکلینکی[1] (التجارب الطبیه السریریه)

زانا و پرۆفیسۆری ئەمریکی، دکتۆر «دین هایمەر» (Dean Hamer) کە بسپۆرە لە زانستی بۆماوەیی (علم الوراثه)دا ل زانکۆی هارڤارد، لە پەرتووکەکەیدا «جینی خودا» (The God Gene) دوویات دەکاتەوە کە خوارسکی شتێکی گشتگیرە لای هەموو مرۆڤەکان، چونکە مرۆڤ لە زگماکەوە هەیبووە، دەشلێت: "باوەڕبوون بە خودا شتێکی خوارسکە لە جیناتی مرۆڤدا."[2] هەروەها زانا و پرۆفیسۆر «جەستین بارێت» (Justin Barrett) ی لێکۆلەر لە سەنتەری ئەنثروپۆلۆژیا و مێشک لە زانکۆی ئۆکسفۆرد و خاوەنی پەرتووکی بەناودەنگ: (Born Believers - فطریه الایمان)دا باس لە سەلماندنی لێکۆڵینەوە زانستییەکان دەکات لەبارەی ئەوەی کە چۆن منداڵ هەر لە کاتی لەدایکبوونییەوە بە شێوەیەکی خوارسکی باوەڕی بە خودا هەیە و بە باوەڕداری لەدایک دەبێت. لێکۆڵینەوە زانستییەکان ئەوەشیان سەلماندووە، گەشەکردنی عەقڵی منداڵ بیروباوەڕییەکی بەرز ئاشکرا دەکات کە منداڵ بەشێوەیەکی ئاسایی و خێرا عەقڵیان گەشە دەکات، ئەوەش باوەڕبوونیان بە بوونە بەرزەکانی وەک خودا لا ئاسان دەکات. «بارێت» دەڵێت: "دوای ئەوەی بۆ ماوەی بیست ساڵ پشکنینمان لەسەر منداڵەکان کرد، بە شێوەیەکی زانستی بۆمان ئاشکرا بوو کە منداڵ خاوەن باوەڕێکی خوارسکە و لەگەڵ بوونیاندا باوەڕیان لە ناخدا هەیە."[3]

---

(١) زاراوەیەکی یۆنانییە.

(2)The God Gene: How faith hardwired into our genes (New York: Anchor,2005.)

(3) Children are born believers in God, academic claims. http://www.telegraph.co.uk/news/newstopics/religion/3512686/Children-are-born-believers-in-God-academic-claims.html

## ٤- بوونی خوارِسکی (الفطرة) بەپێی مێژوو

فەیلەسووفی مێژوویی «ویل دیورانت» لە پەڕتووکی (قصه الحضارة)دا، دووپاتی لەوە کردووەتەوە: "زۆر لە هۆزە سەرەتاکانی کۆن، سەرەتا وشەی «خودا»یان بە مانای «ئاسمان» بەکارهێناوە، هەروەها ئاسمان لای مەغۆڵەکان خوای گەورە بووە، لە چینیش هەر بەو مانایە بوو، لە پەڕتووکی «ڤیدا»ی ئایینێکی هیندیدا خودا مانای «ئاسمانی دایک»ی دەدا و لای یۆنانییەکان «ئەو ئاسمانەی هەورەکان دەنێرێت» و لای فارسەکانیش «ئوهرا» بوو، واتە: ئاسمانی شین. بەم جۆرە بۆمان دەردەکەوێت کە مرۆڤ بە شێوەیەکی خوارِسکی و ویژدانی، باوەڕدارە."[1]

زۆر بەڵگەی قورئان و سوننەت لەسەر هەبوونی بنەما خۆڕسکییەکان هەن، بەڵام لە کاتی گفتوگۆکردن لەگەڵ مولحیدان لە بابەتی زانستی و فەلسەفیدا، تەنیا بەڵگە عەقڵی و فەلسەفی و زانستییەکان ناچاریان دەکەن دانی پێدابنێن، یان عەقڵ و زانست ڕەت بکەنەوە. بەم جۆرە هەڵەکانیان بەڕوونی بۆ خەڵکی دەردەکەون.

ئەمانە هەمووی بەڵگەی بڕاوەن لەسەر هەبوونی فیترەت و خوارِسکی لە هەموو مرۆڤەکاندا کە خودایەک ئەم گەردوونەی دروست کردووە. جا بە چی لۆژیکێک دەکرێت ئەم گشتگیرییەی فیترەت تایبەت بکرێت بە باوەڕدارانەوە (موسڵمان، مەسیحی، یان یەهوودی ...)؟ جا مادام هەموو مرۆڤێک لە چەمک و مەفهومی فیترەت و خوارِسکیدا تێدەگەن، ئەوکات پێویستە هەموو مرۆڤێک بەڕاستی بەدوایدا بگەڕێن و لێی بکۆڵنەوە، تا بگەن بە خوای تاقانە و ئایینی ڕاست و دروست.

---

(١) پەڕتووکی (قصة الحضارة)، ول دیورانت: (١/ ١٠٣- ١٠٤).

## سێیەم: هەڵەی بڕیاردان لەسەر گریمانە مێژووییەکان بەبێ بەڵگە

باسی ئەم بابەتە ئەوەیە مرۆڤ بێ بەڵگە بڕیار لەسەر هەندێک شتی خەیاڵی و مێژوویی بدات، ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە، هەر وەک لای فرۆید هەبووە.

پزیشکی نەمساوی (سیگموند شالۆم فروید - Sigmund Freud) دەڵێت کە پاڵنەری هەموو کارێکی مرۆڤ سێکسە، هەتا منداڵیش بە حەزی سێکسەوە شیری دایکی دەخوات، کچ بە حەزی سێکسییەوە باوکی خۆش دەوێت، کوڕیش هەر لەرئەوە دایکی خۆش دەوێت. فرۆید کاتێک باسی ئایینەکان دەکات، دەڵێت: لە سەرەتای مرۆڤایەتیدا جارێک هەندێک لە کوڕەکان ویستیان بچنە لای دایکیان تا سێکسی لەگەڵدا بکەن، بەڵام لەبەر باوکیان نەیان دەوێرا، بۆیە بڕیاریان دا باوکیان بکوژن و کوشتیشیان. جا چوون کاری سێکسییان لەگەڵ دایکیاندا کرد، بەڵام پاش ماوەیەک هەستیان بە پەشیمانی کرد، چونکە باوکیان سەرچاوەی خۆراکی ڕۆژانەیان بوو. ڕۆیشتنە سەر گۆڕی باوکیان و هێمای (طوطم)یان[1] لەسەر دروستکرد بە ئاماژەی ئەوەی نابێت بچیتە لای دایکت. ئەمەش یەکەم کار بوو کە حەرام کرا. بەم جۆرە خەڵک کاری بۆ خۆی حەڵاڵ و حەرام دەکرد و ئایینیان دروست دەکردن. ئەوەش یەکەم ئایین بوو لە مێژوودا دروست کرا.[2]

بەڕاستی ئەوەی فرۆید لەسەر دەستپێکی ئایینەکانی وتووە، هەڵەیەکی گەورەی هزری و لۆژیکی و مێژووییە، چونکە هیچ بەڵگەیەکی مێژوویی لەسەر ئەم باسە نییە. دووپاتکردنەوی ئەم قسەیەش پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زانستی هەیە، هەروەها پێویستی بە بەم جۆرە بەڵگانە هەیە، تا بسەلمێنرێن:

---

(١) (طوطم): هێمای پیرۆزی و ئایینداریە لای مرۆڤە سەرەتاکان.

(٢) پەڕتووکی: (الطوطم والحرام) فروید: (١٣١ – ١٣٢)، پەڕتووکی (حياتي والتحليل النفسي) فروید: (٥٧ - ٦٠).

١-بەڵگەی مرۆڤناسی (Anthropology) (علم الانسان)

٢-بەڵگەی مرۆڤناسیی کۆن (Paleoanthropology)(علم الإنسان القديم)

٣-بەڵگەی زانستی مرۆڤناسیی زمانی (Linguistic Anthropology) (علم الإنسان اللغوی)

٤-بەڵگەی شوێنەوارناسی (Archaeology) (علم الاثار)

بەڵام فرۆید هیچ یەکێک لەو بەڵگانەی بەکارنەهێناوە لە هیچ لە پەڕتووکەکانیدا، هیچ لە پشتیوانەکانیشی تا ئێستا نەیانتوانیوە یەکێک لەو بەڵگانە لەسەر بۆچوونی فرۆید بەکاربهێنن.

زیاتریش بەداخەوە، چونکە ئەم بۆچوونە گریمانەی فرۆید خۆیشی نییە، بەڵکوو لە ئەفسانەیەکی ئەغریقی وەریگرتووە کە پێی دەڵێن «گرێی ئۆدیب»(عقدة اوديب Oedipus complex) ئەو گرێیەیە کە لە ئەفسانەی ئیغریقیدا هاتووە کاتێک کوڕ حەز لە دایکی دەکات و لەبەر باوکی ناتوانێت سێکسی لەگەڵدا بکات. بەرانبەر ئەوەش «گرێی ئەلیکترا» هەیە (عقدة إليكترا Electra complex) کاتێک کچ حەزی سێکسیی بۆ باوکی هەیە و لەبەر دایکی ناتوانێت. واتای ئەو گریمانەیە هەست و هزری سێکسی شاراوەن و لە عەقڵی نائاگا (العقل الباطن)ی منداڵیدا دەمێننەوە. درێژەی ئەم بابەتە لە (Electra after Freud Myth and Culture) (إلكترا بعد فرويد: أسطورە و ثقافه) بخوێنەوە. بەپێی زانیارییەکانم زۆر لێکۆڵینەوەی زانستی هەن کە بۆچوونی فرۆید ڕەت دەکەنەوە لەبارەی گرێی ئۆدیب و شیکاریی دەروونی. یەکێک لەو لێکۆڵینەوانە تێیدا زانای دەروونناسی ناودار (کارل یونگ - Carl Jung) دووپات دەکاتەوە کە فرۆید هیچ بەڵگەیەکی زانستیی نییە لەسەر گریمانەکەی دەربارەی شیکاریی دەروونیی سێکسی. هەروەها زانای

ئەمریكی (د. برسیفال بیلی _ Percival Bailey) ڕەخنەیەكی زانستی لە «شیكاریی دەروونی»ی فرۆید دەگرێت، بەتایبەت لە پەڕتووكەكەیدا بە ناوی (نقد نظرية التحليل النفسي).[1]

بەڵام بەداخەوە ئەم لێكۆڵینەوە زانستییانە لە ڕاگەیاندنەكان و زانكۆكاندا ناخرێنە بەر باس، زۆربەی زانكۆكان ئێستاشی لەگەڵدابێت تیۆری شیكاریی دەروونی فرۆید دەخوێنن بەتایبەتیش لەبارەی حەزی سێكسی.

باشە كاتێك فرۆید دەڵێت كە سێكس پاڵنەری مرۆڤە بۆ هەر كارێك، نابینێت كە زۆر كەس خۆیان بە كوشت دەدەن بۆ وڵاتەكەیان، یان لەپێناو دادپەروەری، یان لەپێناو هاوڕێكانیان و هیچ پاڵنەرێكی سێكسیشی لەپشتەوە نییە؟! بەڵام واقیع و ڕاستییەكە ئەوەیە، ئەوە تەنیا هەستێكی فرۆید بووە و بەسەر هەموو خەڵكەوە گشتاندوویەتی.

ئەوەش هەڵەیەكی لۆژیكی گەورەیە كە شتێكی تایبەت بگشتێنرێت.

وەڵامدانەوەیەكی تری سادەی عەقڵی ئەوەیە:

ئەگەر بڵێین مرۆڤە سەرەتاییەكان ئەوەیان كردووە، ئەی باشە كەی كردوویانە؟!

ئەگەر بەپێی تیۆری پەرەسەندن بڕۆین، ئەو كات دیارە لە سەردەمی مرۆڤی «نیبراسكا» بووە بەر لە نزیكی ملیۆن ساڵ.

یان لە سەردەمی مرۆڤی چالاك (الإنسان الماهر- Homo habili) كە پێش ملیونەها ساڵ بووە.

یان لە سەردەمی مرۆڤی باڵاڕاست (الإنسان المنتصب - Homo Erectus)

---

(١) ئەم پەڕتووكە لەلایەن د. موحەممەد هیلالەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

ئەوەش پێش ملیۆنان ساڵ بووە.

یان لە سەردەمی مرۆڤی عاقڵ (Homo Sapiens) کە بەر لە ٣٠٠ هزار ساڵ بووە.

باشە ئەگەر ئەم ڕووداوە پێش ٣٠٠ هەزار ساڵ بووبێت، فرۆید بە چ بەڵگەیەکی مێژوویی ئەمەی پەسەند کردووە؟ بەڵام لە ڕاستیدا ئەوە تەنیا خەیاڵێکە و وەک باسمان کرد کە لە ئەفسانەی ئیغریقی وەری گرتووە و هەستە تایبەتەکەی بەسەر هەموو مرۆڤەکاندا گشتاندووە.

دەبینیت؟! مولحیدان دێن باوەڕ بە گریمانەی فرۆید دێنن کە باسی بەر لە ملیۆنان ساڵ دەکات، بەڵام باوەڕ بە فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) ناهێنن کە بەر لە ١٤٠٠ ساڵ بە سەنەدەوە گوێزراونەتەوە و هەر فەرموودەیەک پێویستە بە چەند فیلتەرێکدا تێپەڕێت، تا وەربگیرێت. ئێمە بە پێوەری عەقڵی و بەدرێژی ئەوەمان دووپات کردووەتەوە لە پەڕتووکەکەماندا بە ناوی: «هەڵوەشاندنەوەی گومانەکان لەبارەی قورئان و سوننەت».

## چوارەم: هەڵەی پێوانی شتی مەعنەوی بە پێوەری ماددی

ئەم هەڵەیە لای شوێنکەوتووانی ڕێبازی ماددیگەراییەوە بەکارهێنراوە، ئەوانەی دەڵێن: ئایین شتێکی دەستکردە. هەندێک لەو بیرمەندانەی لەدوای ئەم ڕێبازە دەڕۆن: «سپێنسەر و فرۆید و دۆرکایم»ن. ئەمانە وا دەبینن کە بنەمای مرۆڤایەتی نەبوونی ئایینە، لای مرۆڤەکان هزری ئایینی لە خەیاڵەوە دەستی پێ کرد و هێدی هێدی پێشکەوت تا گەیشتە هاوبەشیدانان (شرک) و بتپەرستی و تا ئەمڕۆ گەیشتە ئایینی تاکپەرستی.[1]

---

(١) الأديان والمذاهب: منهج المقرر في الجامعة المدينة العالمية - ماليزيا: (٨٣).

یەکێک لە بەڵگەکانی ئەم خاوەن قسانە، پێوانی دروستبوونی ئایین و بەرەوپێشچوونیەتی لەسەر پێوەری پیشەسازی و پێشکەوتنی. وتیان هەروەک چۆن مرۆڤە سەرەتاییەکان دواکەوتوو بوون و پاشان فێری دروستکردنی شتەکان بوون و پێشکەوتن، بە هەمان شێوەش لە سەرەتادا ئایینیان نەبووە ودواتر بیری ئایینیان لا پەیدا بووە و هێدی هێدی پێشکەوتوون تا گەیشتوونەتە یەکخواپەرستی.

بەڕاستیش ئەوە پێوەرێکی ناڕاستە و هەڵەیەکی لۆژیکییە لە چەند لایەکەوە:

١-ئایین شتێکی مەعنەوی و ڕۆحییە و پیشەسازی شتێکی ماددی و تاقیکارییە، جا چۆن شتێکی مەعنەویی نەبینراو لەگەڵ شتێکی ماددی دەپێورێت و هاوتا دەکرێت؟ ئاشکرایە کە بەپێی زانستی لۆژیک ئەمە پێوەرێکی ناڕاستە.

٢- پیشەسازی شتێکی سروشتییە و دەکەوێتە بەر تاقیکردنەوە، لەسەر بنەمای تاقیکاری و تێبینی بەڕێوە دەچێت و دوای تاقیکاری ئەنجامەکانی دەردەکەوێت. بەڵام ئایین شتێکی گرێدراوە بە بەڵگەی هزری و مەعنەوییەوە، هەروەها گرێدراوە بە هەستکردنی دڵەوە، لە دونیادا ناکەوێتە ژێر تاقیکردنەوەی ماددی و ئەنجامەکانیشی دیار نابن.

بەپێی ئەم پێوەرە، پێویستە لەو کاتەوە خەڵک هەمووی ئاییندار بووانە، لەبەرئەوەی پێشکەوتنی ئایینیان لەگەڵ پێشکەوتنی پیشەسازی پێوانە و هاوتا کرد. جا پێیان دەڵێین پیشەسازی گەیشت بە پێشکەوتنێکی گەورە، بۆیە پێویستە ئایینیش پێش بکەوێت و هەموو مرۆڤێک گەیشتبێتە یەکخواپەرستی (التوحید). بەڵام دەبینین واقیع پێچەوانەی ئەمە دەڵێت، چونکە پەرستن ئێستا لەناو مرۆڤەکاندا زۆر کەم بووەتەوە و بتپەرستی و هاوەڵدانانیش هێشتا لە زۆر وڵاتی جیهاندا ماوە. جا ئەگەر ئایین لە شیرکەوە بۆ تاکپەرستی پێش بکەوێت،

ئەوا دەبووایە ئێستا مرۆڤەکان هەموویان یەکخواپەرست بووانە.

بەپێی پێوەرەکەیان کە پێوەری پێشکەوتنی ئایینە شانبەشانی پێشکەوتنی پیشەسازی، دەبووایە پەیوەندییەک لەنێوان پاشکەوتەیی کۆمەڵگا و بتپەرستی هەبووایە، دەبووایە کۆمەڵگا پاشکەوتووەکان بتپەرست و هاوەڵدانەر بووانە و کۆمەڵگا پێشکەوتووەکانیش یەکخواپەرست بووانە. بەڵام دەبینین ئەوە پێچەوانەی واقیعی ئێستامانە، چونکە یابان و چین و کۆریا و زۆر لە وڵاتانی تری ڕۆژئاوا گەیشتوونەتە بەرزترین ئاستی پێشکەوتنی پیشەسازی، بەڵام هێشتا لەسەر شیرک و ئیلحاد دەڕۆن. ئەگەر پەیوەندییەک لەنێوان پێشکەوتنی ماددیگەرایی و ئاییندا هەبووایە، ئەوکات ئەم وڵاتە ئاییندار و یەکخواپەرست دەبوون.

پێوەرەکەیان دروست نییە، چونکە پیشەسازی لە شتێکەوە دەستی پێ کرد و دواتر بووە زۆر شتی پێکەوەگرێدراو، بەڵام ئایین -بەپێی هزری ئەوان- لە پێکهاتەی چەندین شت دەستی پێ کرد کە هاوەڵدانانە و پاشان بوو بە یەک شت کە یەکخواپەرستییە. ئەوەش وەک ڕۆژی ڕووناک دیارە کە پێوەرەکەیان هەڵەیە.

ئێمە لە هەردوو پەڕتووکەکانماندا: «ئیلحاد» و «تیۆریا مەعریفیێ» بە بەڵگەی عەقڵی و زانستی و مێژوویی سەلماندوومانە کە بنەڕەت لە مرۆڤدا ئایین و باوەڕی خواپرسکە. بۆ زانیاری زیاتر لەو بارەیەوە دەتوانن بگەڕێنەوە سەر ئەم دوو پەڕتووکە بە زاراوەی بادینی.

## پێنجەم: هەڵەی هۆکاری ناڕاست

ئەم هەڵەیە بەزۆری لە ڕاگەیاندا دەکرێت. ڕووداوێک دێنن و هۆکارێکی ناڕاستی بۆ دادەنێن. بۆ نموونە، پاشکەوتنی شارستانییەت لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست یان وڵاتە عەرەبییەکان و لەناو میللەتی خۆشماندا بۆ دینداری دەگەڕێننەوە، خۆشمان دان بەوەدا دەنێین کە ئێمە لە ڕووی شارستانییەتەوە پاشکەوتووین، بەڵام نەک وەک کەسێکی سێکیولاریزم کە هۆکارەکەی بۆ دینداری دەگەڕێنێتەوە.

لە واقیعیشدا، ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە، ڕاستە ڕووداوەکە هەیە کە «پاشکەوتنە»، بەڵام ئەو هۆکارەی بۆیان داناوە هەڵەیە کە «دیندارییە»، چونکە زۆر هۆکاری تر هەن، بەڵام ئەوان پەنجە لەسەر لایەنی دینداریی دادەنێن تا هۆکارەکانی تر بزر بکەن و ئایین لەبەر دڵی خەڵکی ڕەش بکەن.

یەکێک لە بەڵگە واقیعییەکان لەسەر ئەم هەڵەیە، ئەوەیە سەد ساڵە سێکیۆلاریزم حوکم لە وڵاتە عەرەبییەکان دەکات. دەسەڵاتی پەرلەمان، ئەنجوومەنی وەزیران، سەرۆک حوکوومەتەکان، سەرۆک پەرلەمان و هەموو ئەوانی تر لە دەستی سێکیۆلاریزمدان. وەزیری پلاندانان، پەروەردە، خوێندنی باڵا، سامانی سروشتی و دارایی لە هەموو لایەکەوە لە دەستی ئەواندایە و بەرپرسەکانیان هەموویان سێکیۆلاریزمن. سەرەڕای ئەوەی زۆر سامانی نەوت و گاز و سامانی تری سروشتی هەن و لەژێر دەستی سێکیولاریزمدان، بەڵام هێشتاش زۆربەی ئەو وڵاتانە لە لایەنی شارستانییەوە هەژار و پاشکەوتوون. جا بۆیە هۆکاری ئەم پاشکەوتنە و هەژاری گەندەڵیی دەسەڵاتەکانە و، هەڵەیەکی گەورەیە ئایین بکەن بە هۆکار.

هەروەها هیچ بەڵگەیەکی تاقیکاری (تجریبي) و زانستی لەسەر ئەوە نین کە ئەگەر کەسێک دیندار بێت و ڕشدار بێت یان ئافرەتێکی باڵاپۆش بێت،

ئاستی زانستییان کەم بێت. بەم جۆرە دیارە کە ئەو بۆچوونەیان هەڵەیەکی هزریی گەورەیە، ئەمەش لە نیشانەی مرۆڤی کەوتوو و شکستخواردووە، کاتێک هەڵەکانیان دەدەنە پاڵ کەسانی تر. وەک ئەو قوتابییەی لە تاقیکردنەوە دەکەوێت و دەڵێت مامۆستا ستەمی لێ کردووە. بە هەمان شێوە کاتێک دەسەڵاتی سێکیۆلاریزم بە گەندەڵیی خۆیان وڵاتیان کاول کرد، دەڵێن هۆکار دینداریيە.

جۆرێکی تری هۆکاری ناڕاست ئەوەیە کەسێکی بیرمەند یان بانگخواز دێت ڕووداوێکی فرە هۆکار دێنێت و تەنیا لە هۆکارێکدا قەتیسی دەکاتەوە. بۆ نموونە، بانگخوازێک هۆکاری چوونی گەنجان بۆ دەرەوەی وڵات تەنیا بۆ شەهوەت دەگەڕێنێتەوە و دەڵێت: هیچ هۆکارێکی تر نییە، گەنجان تەنیا بۆ حەز و هەوەسیان دەڕۆنە ئەورووپا. دەکرێت ٥٪ی هۆکارەکە ئەوە بێت، بەڵام دەکرێت ٩٥٪ ی تری هۆکاری کۆچی گەنجان بێکاری و بێهیوابوون بێت لە حوکوومەت، سەرەڕای گەندەڵکاریی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ... هتد. بۆیە هەڵەیەکی هزریی گەورەیە کۆچی گەنجان بۆ یەک هۆکار بگەڕێندرێتەوە و هۆکارە سەرەکییەکانی تر بشاردرێتەوە.

پێویستە ئامۆژگاریکار و ڕۆشنبیر و بانگخوازەکان هانی حوکوومەت بدەن کار بۆ گەنجان دابین بکەن، گەندەڵیی نەهێڵێت، دەرچووەکان دابمەزرێنن، کارگەکان دابمەزرێنن، دادپەروەریی دەستەبەر بکات، سولفە و قەرزی هاوسەرگیری بدات، ...هتد، تا ئەم کێشەیە چارەسەر بکەن و کۆچ نەکەن.

ئەمە وەک نموونەیەک کە زۆر جار ڕاگەیاندن هەڵەی وا دەکات، تەنیا هۆکارێک باس دەکات و گرنگیی پێ دەدات، هەموو هۆکارەکانی تر پشتگوێ دەخات، تا بینەرەکانی بخەڵەتێنێت و ڕاستییەکانی لێ بشارێتەوە.

## شەشەم: هەڵەی دەستکاریکردن (تحریف) لە قسەی بەرانبەردا

ئەم هەڵەیە لە ڕاگەیاندن یان گفتوگۆ سیاسییەکاندا زۆر دەکرێت. بۆ نموونە، کەسێک بەڵگەیەک دێنێت، بەرانبەرەکەی ناتوانێت بە شێوازێکی زانستی بەڵگەکەی ڕەت بکاتەوە، جا دێت دەستکاری بەڵگەکەی دەکات و بە شێوازێکی هەڵە شیکاری دەکات، تا بتوانێت لە بەرانبەرەکەی بباتەوە و خەڵک لە خشتە ببات. هەروەک لە پەرلەمانێکدا کەسێک لە بەرەی ئۆپۆزسیۆن هەستا و داوای لە حوکومەت کرد پەرە بە پەروەردە و لێکۆڵینەوە زانستییەکان بدەن تا وڵات پێش بکەوێت. یەکێک لە پەرلەمانتارانی دەسەڵات هەستا و وتی: قسەی ئەم پەرلەمانتارە خیانەتە لە وڵات، چونکە قسەکەی واتای ئەوە دەدات کە پەرەپێدان بە سوپا کەم ببێتەوە، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی سنوورەکان سست ببن و دوژمن بەئاسانی بێتە ناو وڵاتەوە.

ئا ئەمەیە هەڵەی دەستکاریکردنی قسەی بەرانبەر. ئەو داوای کرد پەرە بە پەروەردە بدرێت، داواکەی ڕاست بوو و مەبەستیشی پاک بوو، بەڵام بەرانبەرەکەی دەستکاری لە قسەکەیدا کرد و بە شێوازێکی هەڵە شیکاریی بۆ کرد، تا بتوانێت داخوازییە ڕەواکە ڕەت بکاتەوە و بەرژەوەندیی دەسەڵات بپارێزێت.

## حەوتەم: هەڵەی وشەی ئاڵۆز

ئەم هەڵەیە پێناسە دەکرێت بەوەی: دانانی دەقی یاساییانەیە بە شێوەیەکی ئاڵۆز کە لە سەرەوەدا چاکسازییە و لە ناوەڕۆکدا پیلانی ستراتیژی پیسی لەخۆ گرتووە. هۆکاری ئاڵۆزی لەم جۆرە هەڵەیەدا، ئەو وشانەن کە وا لە ئاخاوتن دەکەن بێ ڕەخنە وەربگیردرێن. بەزۆری بەرپرسی سیاسی و ڕاگەیاندنەکان ئەم هەڵەیە بەکاردێنن بۆ بەجێهێنانی پرۆژە یاسایی و سیاسی و هزری و

سەربازییەکانیان.

باشترین نموونە لەسەر ئەمە، ئەوەیە کە حوکوومەتی ئەمریکا دووبارەی دەکاتەوە: "ئێمە ڕێز لە سەرکردایەتی وڵاتان دەگریان و بە سوپاوە ناچینە ناو خاکی هیچ میللەتێک، بەڵام ئەگەر میللەتان خۆیان داوایان لێ کردین، ئەوکات داواکارییەکەیان قبووڵ دەکەین." بەم جۆرە ئەمریکا دۆسیەی سەرخستنی میللەتانی بەخۆوە گرت، بەبیانووی ڕووخاندنی ئەو حوکوومەتانەی لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی ئەمریکادا نەبن. داگیرکردنی وڵاتان و زەوتکردنی سامانیان و دانانی حوکوومەتی وەها کە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانیان دەگونجێن و لەسەر پرۆژەکانی داگیرکردنەکەی ڕازین. نموونە لەسەرئەمەش لە ڕابردوو و ئێستادا زۆرن. یانیش پشتگیری ئەو حوکوومەتانە دەکەن کە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانیدا دەگونجێن، تەنانەت ئەگەر میللەتیشیان کۆمەڵکوژ کردبێت، هەروەک ئەوەی لە سووریا و بۆرما وئەفریقیای ناوەڕاست و ... هتد هەیە. زۆر نموونەی تریش لەم بارەیەوە لە واقیعی ئێمەدا بوونی هەیە.

نموونەیەکی تر: کاتێک میلیشیا لەشکەرییە شیعەکان لە عێراق ویستیان بەرەنگارەکانیان لەناو ببەن، سوننەکانیان لە بەغدا و سامەڕا دەرکردن. ئەوانیش کاریان کرد بۆ دانانی یاسای «چوار تیرۆر» (یاسای بەرەنگاربوونەوەی تیرۆری عێراقی ژمارە ١٣ بۆ ساڵی ٢٠٠٥). لە ڕاستیشدا توانییان یاساکە بخەنە پەرلەمانی عێراق و ئەوەش ڕوویدا، چونکە زۆرینە بوون لە پەرلەمان. یاساکە بەڕواڵەت بەرەنگاربوونەوەی تیرۆر بوو، بەڵام ئەوان لەدژی سوننەکان لە بەغدا و سامەرا بەکاریان هێنا. هەستان بە دەستگیرکردنی گەنجانی سوننی لە هەموو ناوچەکان و ئاوارەکردنی خێزانەکانیان و نیشتەجێکردنی شیعەکان لە شوێنیان بۆ گۆڕینی دیمۆگرافیای ئەو شارانەی زۆرینە سوننەن و گواستنەوەیان بۆ ناوچە شیعەنشینەکان. ڕژێمی بەعسیش هەمان کاری دژ بە میللەتی کورد کرد. ئەوانیش هەستان بە ئاوارەکردنی کوردەکان لە ناوچە

کوردییەکان و نیشتەجێکردنی خێزانە عەرەبەکان لە شوێنی ئەوان بە مەبەستی «پاراستنی ئارامیی نەتەوەیی».

## هەشتەم: هەڵەی وەرگرتنی ناتەواو (مغالطة الاقتباس الناقص)

ئەم هەڵەیە وەرگرتنی بەشێکە لە قسەی زانایەک یان پەرتووکێکی بەناتەواوی. ئەمەش تاوەکوو تانەی لێ بدەن یان تا لە بەرژەوەندیی ئایدیۆلۆژیایەکی دیاریکراو شیکاری بکەن.

ئەم هەڵەیە بە شێوەیەکی بەرچاو لەنێو نووسەر و ڕۆشنبیرە نادادپەروەرەکانەوە بڵاوە. هەروەها لەناو چینە جیاوازەکانی تریش بەکاردەهێنرێت، وەکوو هەندێک بێباوەڕ و کەسانی عالەمانی لە دژی ئاییندا بەکاریدێنن، زۆر جار ئاییندارەکانیش لە دژی یەکتر بەکاری دێنن. هەتا هەڵگرانی هەمان ئایینیش، چینێک لە دژی چینێکی تر بەکاردێنن، لەناو پارتی سیاسییش بە هەمان شێوە، پارتێک تانە لە بنەما و بڕیاری پارتێکی دژ دەدات لە ڕێگەی بڕینی دەقەکانی و وەرگرتنی بەشێکی کەم لەو دەقانەیان کە دەبە هۆکاری هەڵەتێگەیشتن.

ئەم شێوازی ساختەکردنە کارێکی ناشیرینە و دژی بنەما و پێوەری ئایینی و ڕەوشتی و یاسایی و ئەکادیمییە. سەرەڕای حەرامیی ئەم کارە لە ئاییندا، بەڵام هێشتاش لای کاسانێکی باوەڕدار بەربڵاوە و وەک تانەیەک بۆ لێدان و دژایەتی چین و ڕێبازەکانی تر بەکاردێنن.

ئەم شێوازەی ساختەکاری (گواستنەوەی قسەی زانایان بە شێوەیەکی ناتەواو) مانای ڕاستەقینە ناهێڵێت و وا لە گوێگر دەکات هەست بە کەموکورییەک بکات، ئەویش نەبوونی ئەمانەتە لە گواستنەوەدا، ئەمەش بە نەهێشتنی

هەندێک ئامرازی ڕێزمانی لە شیکارکردندا. هەر ئەمە دەبێتە هۆکاری گۆڕینی ئەوەی مەبەستییەتی. یان هەندێک جار نووسەرێک نووسینی یەکێک لە تەفسیرەکان دەگوازێتەوە و گوێگر دەخەڵەتێنێت بەوەی کە قسەی موفەسیرەکەیە، لە کاتێکدا موفەسیرەکە وەک وتەیەکی لاواز باسی کردووە، یان ڕوونی کردووەتەوە کە بۆچوونێکی لاوازە و شایەنی وەرگرتن نییە.

نموونەی بەکارهێنانی ئەم هەڵەیە لای ڕۆژهەڵاتناسان:

ڕۆژهەلاتناسان زۆر شەکیان لەبارەی یاساکانی قورئان بەگشتی و بابەتی ئافرەت و پێگە و مافەکانی لەقورئاندا ورووژاندوون. شەکەکانیش بەجۆرێکن کە لەسەر نەتەوەپەرستییەکی کوێر و ڕق و کینەیەکی شاراوە و لەسەر هەڵەی لۆژیکی و هەڵەی هزری بنیاتنراون.

وەڵامی بەشێک لە شەکەکانیان:

ئەو شەکەی پێی وایە سیستمی میراتگری لە ئیسلامدا ستەمی لە ئافرەت کردووە، بەوەی نیوەهێندەی پیاو میرات دەبات. دەبینین ساختەکارییەکەیان ئەوەیە کە سیستەمی میراتگرییان لە یەک باردا کەمکردووەتەوە، ئەویش کچ نیوەی پشکی کوڕ وەردەگرێت. ڕوونە کە ئەوە ساختەکاریی هەڵەی «وەرگرتنی ناتەواو»ە، چونکە سیستمی میرات لە قورئاندا سیستمێکی تەواوکەر و (متكامل) و تەواوە، بەڵام ئەوان تەنیا بەشێکیان نیشاندا و بەسەر هەموو سیستمی میراتگرییان گشتگیر کرد. ئەگەر هەموو باسەکەیان پیشاندابووایە، نەیاندەتوانی تانەی لێ بدەن. جا بۆیە پێویستە بابەتی میرات لە هەموو لایەکانییەوە بخوێندرێت، ئەمەش بۆ تێگەیشتن لە تەواوی بابەتەکە و ڕوونکردنەوە و نەهێشتنی لێڵی و تانە و تاریکی لەسەر تێڕوانینە پارچەکراوەکەی خۆرهەڵاتناسان بۆ ئایەتەکانی میرات، ئەو تێڕوانینەی کە سەرنجیان تەنیا

خستووەتە سەر ئایەتێک بێ پێکەوە گرێدانی بە ئایەتەکانی تری میراتەوە، یان پێکەوەگرێدانی بە مافەکانی ئافرەتەوە لە ئایەتەکانی تردا. لەبەرچاوگرتن و سەیرکردێنی تەواو بۆ ئایەتەکانی میرات و سیستمەکەی لە قورئاندا، ئەوە دەردەخات کە ئافرەت تەنیا لە پێنج جێگادا نیوەی پیاو وەردەگرێت و لە پێنج کاتیشدا هێندەی پیاو وەردەگرێت و دە کاتی تریش زیاتر لە پیاو وەردەگرێت، هەندێک کاتیش هەیە ئافرەت میرات وەردەگرێت و پیاو وەری ناگرێت. بەم جۆرە دەتوانین بڵێین دادگەریی کۆمەڵایەتی ئەساسە لە دیارکردنی بەشە میراتدا، چ بۆ ئافرەت چ بۆ پیاو، بەشە میرات مافی هەرکەسێکە و بەپێی نزیکیی نەوە و خزمایەتییە. ئەوەی باسمان کرد ئاستی ساختەکاری و بێمانایی شەکی خۆرهەڵاتناسەکانە لەسەر وردەکارییە دیارکراوەکانی ئایەتەکانی میرات لەبارەی ئافرەتەوە.

تەنانەت ئەو شوێنەی کە کچ نیوەی کوڕ وەردەگرێت، ڕێزگرتنە بۆ ئەو پێویستییە داراییانەی قورئان لەسەر پیاوی فەرز کردوون، لە خەرجیی دایک و باوک، هاوسەر و منداڵ و هەرکەسێک کە لەژێر چاودێریی ئەو بێت لە خوشک و براکانی. وا باشە باسی ئەوەش بکەین کە شەریعەت هەندێک مافی بە ئافرەت داوە کە بە پیاوی نەداوە، وەک مارەیی و خەرجی. جا ئافرەتەکە دەوڵەمەند بێت یان نا، چونکە خەرجییەکانی لەسەر باوکییەتی ئەگەر کچ بێت، لەسەر کوڕە ئەگەر دایک بێت، لەسەر برایە ئەگەر خوشک بێت، لەسەر بەیتولماڵە ئەگەر کەسی نەبێت بەخێوی بکات.

ئەم ئایەتە میهرەبانییە بۆ خێزان و کێشەی خێزان و کۆمەڵگەیشی چارەسەرکردووە، ئەویش نەهێشتنی ترس و تەماع لە دڵی میراتگر و خاوەن میراتەکان کە سامانەکانیان بۆ کەسانی بیانی بڕوات. هەروەها ئیرەیی لە دڵی خوشک و براکان ناهێڵێت لەبەرانبەر یەکتردا.

بەم جۆرە سەلمێنرا کە ئایەتەکانی میرات سیستمێکی دانایانە و دادپەروەرانەیە.

## نۆیەم: هەڵەی بانگەشەی بێبەڵگە

شێوازی ئەم جۆرەیان: بەبێ بەڵگە بڕیار دەدەن لەسەر ئەو پرسانەی ناکۆکیی یان دژایەتییان لەگەڵدا هەیە. وایشی پیشان دەدەن کە شتێکی ئاشکرایە و پێویستی بە بەڵگە نییە.

ئەم کارە ساختەکارییەکی ئاشکرایە، چونکە هەر پرسێکی ناکۆکی لەسەر هەبێت، نابێت بەبێ بەڵگە بە ڕاست یان هەڵە بڕیاری لەسەر بدرێت، چونکە ئەوەی ڕاستی و هەڵە لەیەکتر جیادەکاتەوە، بەڵگەیە.

زۆبەی جار ئەو کەسانەی بێ بەڵگە بڕیارەکانیان دەسەپێنن، هەندێک فێڵ بەکاردێنن بۆ خەڵەتاندنی خەڵک و دوورخستنەوەیان لە داواکردنی بەڵگە. لە ڕاستیشدا زۆر فێڵ و ڕێگا هەن وا لە خەڵک دەکەن وا بیربکەنەوە کە ئەم بابەتە پێویستیی بە بەڵگە نییە، لەو فێڵانەش:

- دڵنیاکردنەوەی خەڵک بەو ڕێگایەی کە ئەوە دۆسیەیەکی پەسەندکراو و ناسراوە و پێویستیی بە بەڵگە نییە، ئەمەش بەپێی قسەی خۆیان کە وا نیشانی دەدەن ئەم شتە لە گۆڤارێکی زانستی وەرگیراوە، یان قسەی زانایێکی گەورەیە.

- وا پیشانی دەدەن کە بڕیارێکی دروستە، چونکە کەس لە دژی نەوەستاوەتەوە، یان هیچ بەڵگەیەک نییە دژایەتی بکات. ئەمەش بە «هەڵەی بەرەو نەزانین چوون» ناونراوە.

- دووبارەکردنەوەی بانگەشە و بڵاوکردنەوەی لەناو خەڵکیدا و بە ڕێگای زۆر تا

زوو بچێتە عەقڵەوە کە ڕاستە. ئەمە ئەو ڕێگایەیە کە پارتەکانی سەر بە دەسەڵات بەزۆری بەکاریدێنن، هەڵدەستن بە بڵاوکردنەوەی دەنگوباسێک لە هەموو کەناڵ و وێستگە و ڕۆژنامەکانی سەربە ئەوانەوە، بە جۆرێک خەڵک وا هەست بکات کە دەنگوباسێکی ڕاستە، چونکە لە زۆر سەرچاوەوە باسی لێوە کراوە، بێ ئەوەی بزانن کە سەرچاوەی هەموو ویستگە و کەناڵ و بڵاوکەرەوەکان هەمان سەرچاوەیە.

-بەکارهێنانی گوشار و هێز و ترس بۆ بێدەنگکردنی خەڵک و ڕازیکردنیان. ئەمەش ئەو ڕێگایەیە کە ڕاگەیاندنی دەسەڵات بۆ بەرەنگاربوونەوەی خەڵکی ناڕازی دەیگرێتە بەر. بە جۆرێک ئەگەر خەڵک داوای مافی خۆیان کرد، یان دژایەتی هەندێک هەڵەی دەسەڵاتی کرد، ڕاگەیاندن هەڵدەستێت بە گەورەکردنی کارەکە و ترساندنی خەڵک. ئەمەش وا نیشان دەدەن کە ئەم کارە لای دوژمنانی وڵاتەوە ڕێکخراوە و دەبێتە هۆی لاوازکردنی سەلامەتیی نەتەوە و هەڕەشەیە بۆ سەر وڵات.

- داواکردنی پشوودرێژی و بەهیوابوون بێ داواکردنی مافەکان. ئەمەش وتاربێژەکانی دەسەڵات دەیکەن کاتێک خەڵک گلەیی هەژاری و بێکاری و نەبوونی خزمەتگوزاری دەکەن. وتاربێژانی دەسەڵات هەوڵ دەدەن بە وتارەکانیان گەندەڵیی دەسەڵات بشارنەوە، خەڵک بخەڵەتێنن و بێهۆشیان بکەن بە ڕێگای شیرینکردنی هەژاری لەبەر دڵیان. ئەمەش بە ڕێگای نیشاندانی گەورەیی خێرکردن و ئارامگرتن لەسەر هەژاری و نیشاندانی خراپییەکانی دەوڵەمەندی کاتێک دەڵێن: دەوڵەمەندی هۆکاری کردنی گوناه و کەوتنەناو هەڵەیە. بەم جۆرە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو میللەت دەخافڵێنن و بێهۆشی دەکەن. شێخ موحەممەد غەزالی لەم بارەیەوە دەڵێت: "هەر بانگێک هەژاری لەبەر خەڵک شیرین بکات، یان بێ ژیان و پێویستییەکانی ژیان خەڵک ڕازی بکات، یان بەوەیان ڕازی بکات هەمیشە لە ژیاندا ئارامگر بن، یان پشوودرێژیان بکات لەسەر کەم وەرگرتن و بێبەهایی، ئەوە بانگێکی درۆیە و مەبەست لێی بێدەنگکردنە بۆ ستەمی کۆمەڵایەتی و هێشتنەوەی خەڵکی ڕەنجبەرە

لە خزمەتی کەسێک یان کۆمەڵە کەسێک. ئەمە پێش هەموو شتێک درۆیێکە لەجیاتی خودا و بە ناوی ئیسلامەوە دەکرێت."

## دەیەم: هەڵەی داواکردنی بەڵگە لە لایەنی بەرانبەر

ئەم هەڵەیە تەواوکەری هەڵەی پێشترە، شێوازەکەیشی بەم شێوەیەیە: نووسەرێک یان بێژەرێک بەبێ بەڵگە حوکم و بڕیارێک لەبارەی کێشەیەک دەدات. ئەگەر کەسێکیش بەرەنگاری بوویەوە، یان داوای بەڵگەیەکی لەبارەی ڕاستیی بڕیارەکەی ئەو کرد، ئەوا نووسەرەکە یان بێژەرەکە دێت داوا لە کەسی بەرانبەر دەکات بەڵگەیەک لە دژی بڕیارەکەی ئەو بێنێت! ئەمەش هەڵەیەکی بەرچاوە، چونکە بەپێی یاسای لۆژیکی بێت بەڵگەهێنان لەسەر بانگەشەکارە، چونکە ئەو کەسەی بانگەشە دەکات، دەبێت بەڵگە بێنێت.

ئەم جۆرە هەڵەیەش لەناو خەڵکیدا بڵاوە. بۆ نموونە، کەسێکی نەتەوەپەرست و توندڕەو جارێک پێی وتم: فڵان زانا کەسێکی لەڕێدەرچووە، چونکە وتوویەتی: "پلەی ئیمامی عەلی لە پلەی پێغەمبەر بەرزترە!"

منیش پێم وت: ئایا بەڵگەیەکت هەیە کە ئەم قسەیەی کردبێت؟

وتی: ئەوە پێویستی بە بەڵگە نییە، چونکە زانایەکی لەڕێدەرچووە.

دواتر پێی وتم: ئەی تۆ بەڵگەیەکت هەیە کە ئەم زانایە وای نەوتووە؟!

بێگومان ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە کردوویەتی، چونکە بانگەشەیەکی درۆی لەسەر زانایەک کردووە، بۆیە پێویستە بەڵگە لەسەر ڕاستیی قسەکەی بێنێتەوە. بەڵام کاتێک نەیتوانی هیچ بەڵگەیەک بێنێتەوە، ئەوا فێڵێکی کردووە تا سەر لە خەڵک بشێوێنێت و هەڵەی خۆی پێ بشارێتەوە.

## یازدەیەم: هەڵەی وروژاندنی هەستی خەڵکی (المغالطة الشعبوية)

کاتێک بانگەشەکار هیچ بەڵگەیەکی نەبێت لەسەر ڕاستیی بانگەشەکەی یان نەتوانێت وەڵامی دژایەتی بەرانبەرەکەی بداتەوە، هەڵدەستێت بە وروژاندنی هەستی کۆمەڵگە و بەکارهێنانی هەست و سۆز بۆ وروژاندنی هەستی خەڵکی ڕەشۆک لە دژی بەرانبەرەکەی. ئەم هەڵەیە لەلایەن کەسانی نەتەوەپەرست و چینێک یان لایەنێکی ئایینی بەربڵاوە. ئەمەش کاتێک کەسێک دژایەتی خۆی لەسەر فەتوای شێخێک دەربڕێت و هەڵەی شێخەکەش نیشان بدات. شوێنکەوتووانی شێخەکە بەڵگەیان نییە وەڵامی بانگەشەکەی بدەنەوە، بۆیە کەسەکە هەڵدەستێت هەستی شوێنکەوتووانی دەورووژێنێت و بەرانبەرەکەی بەوە تاوانبار دەکات کە سووکایەتی بە شێخەکە کردووە و تانەی لە ئایین داوە. بەم جۆرە شوێنکەوتووانی شێخەکە دەورووژێنن و ئەو کەسە بە کەسێکی سەرلێشێواو و فاسق و لە ئایین دەرچوو تاوانبار دەکەن.

ئەم هەڵەیە لەنێوان نەتەوەپەرستەکانیش بەربڵاوە. بۆ نموونە، کاتێک چالاکوانێک ڕەخنە لە گەندەڵیی دەسەڵات دەگرێت، دەبینیت بە وروژاندنی هەستی نەتەوەیی وەڵامی دەدرێتەوە و بانگەشەی ئەوەی لە دژ دەکەن کە تێکدەری حوکوومەت و میللەت و وڵاتی خۆیەتی و ئارامیی وڵات دەشێوێنێت. بەم جۆرە ڕێژەیەکی زۆری خەڵکی ڕەشۆک لە دژیدا هاندەدرێن و تۆمەتباری دەکەن و سووکایەتی پێ دەکەن. ئەمەش لە ڕاگەیاندنەکانی وڵاتە عەرەبییەکان و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست زۆر بەربڵاوە.

ئەم هەڵەیە لە ناوەندە سیاسییەکانیشدا بڵاوە، بەتایبەت لە کاتی هەڵبژاردنەکاندا. بۆ نموونە چالاکوانێک دەڵێت: فڵانە کاندید لە شاری هەولێر دەنگی خەڵکی کڕیوە. ئەمەش بە بەڵگە و بەڵگەنامە دەسەلمێنێت. کاتێک کاندیدەکە ناتوانێت وەڵامی چالاکوانەکە بداتەوە، ناچار دەبێت و قسەی چالاکوانەکە بە شێوازێکی ساختە لێک دەداتەوە. بە خەڵکی هەولێر

دەڵێت: ئەم چاڵاکوانە بانگەشەی ئەوە دەکات کە خەڵکی هەولێر خۆیان دەفرۆشن، چونکە دەنگی خۆیان دەفرۆشنە کاندیدەکان.

بەم جۆرە کاندیدەکە توانی هەستی خەڵکی شاری هەولێر بورووژێنێت و توانی غیرەتی خەڵکی لە دژی چالاکوانەکە بخاتە کار. ئیتر خەڵکێکی زۆر نەفرەت لە چالاکوانەکە دەکەن و بەمەش کاندیدەکە توانی بە فێڵبازیی خۆی خەڵکەکە ل خشتە ببات و خۆی لەو ڕەخنەیە ڕزگار بکات.

بە هەمان شێوە، ئەم هەڵەیە لە ڕاگەیاندنیشدا بڵاوە، بەتایبەت لە ڕیکلامی بازرگانیدا. ئەمەش بە ڕێگای جووڵاندنی هەستی جەماوەر تا خۆیان بە ئەستێرەیەک (کەسی بەناوبانگ) بچوێنن. بۆ نموونە، بەکارهێنانی یاریزانێکی ناسراو کە شەربەتێک دەخواتەوە، دواتر خێرایی یاریزانەکە و هێزی لەشی نیشان دەدات. جا بەم جۆرە جەماوەر وا بیردەکەنەوە کە پەیوەندییەک لەنێوان خێرایی یاریزانەکە و شەربەتەکە هەیە و وا بیردەکەنەوە کە ئەو شەربەتە مرۆڤ بەهێز دەکات. ئاوا ڕیکلامەکە دەبێتە هۆکاری ئەوەی خەڵکێکی زۆر شەربەتەکە بکڕن.

شێوازی هەموو ئەو ڕیکلامانەی کەسانی ناودار دەیکەن، لەم جۆرە هەڵەیەن.

# کۆتایی

دەکرێت بەشێک لە هەڵە هزرییەکان سادە بن، بەڵام زۆرینەیان بزر و ئاڵۆزن، کاریگەری لەسەر خەڵک دروست دەکەن و لە خشتەیان دەبەن. دەکرێت زۆر کەس وا بیربکاتەوە کە دەتوانن زوو هەست بەو هەڵانە بکەن و خۆیان لێ بپارێزن، بەڵام بەپێی لێکۆڵینەوە و خوێندنەوەمان بۆ کۆمەڵگە دەبینین کە رێژەیەکی زۆر لە کەسانی نووسەر و رۆشنبیر و سیاسەتمەدارەکان لە گوتارەکانی خۆیاندا سەفسەتە و هەڵەی هزری ئەنجام دەدەن، بەمەش توانیویانە تا رادەیەکی زۆر کار لە بۆچوونی گشتی بکەن و خەڵک لەخشتە ببەن و بەپێی ویستی خۆیان بەرەو ئامانجەکانیان ببەن. هەروەها توانیویانە بۆ مەبەستی تایبەتی خۆیان بەکاریان بێنن و بیانکەن بە هۆکارێک بۆ دەستەبەرکردنی پرۆژە تایبەتەکانی خۆیان.

بۆیە پێویستە لەسەر خەڵک بەگشتی و لەسەر گەنجان بەتایبەتی تێگەیشتنی خۆیان بەهێز بکەن و ئاستی زانینیان لەسەر بنەمای عەقڵی و مەعریفی بنیات بنێن. هەروەها پێویستە بیری رەخنەیی لای خۆیان چالاک بکەن و مێشکیان بەسەر هەستیانەوە زاڵ بکەن، تا ببن بە خاوەن بڕیار و بەئاسانی نەخەڵەتێنرێن و باوەڕ و کەسایەتی خۆیان لەدەست نەدەن.

# نووسەر لە چەند دێڕێکدا



پرۆفیسۆری یاریدەدەر

د. ئامـــــــاد کــــازم

هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرایە لە زانکۆی ملایا لە مالیزیا

هەڵگری بڕوانامەی ماستەرە لە زانکۆی مووسڵ

لە ساڵی ٢٠١٤ وەک ڕاوێژکاری هزری هەڵبژێردرا، لە کۆڕبەندی جیهانی (صناعة المفكر)، لە وڵاتی مالیزیا.

لە ساڵی ٢٠١٤ وەک وانەبێژ لە بواری هزری و زمانی کاری کردووە لەژێر پرۆگرامی (صناعة المفكر) لە مالیزیا.

هەر لە ساڵی ٢٠١٥وە تا ئێستا مامۆستای فەلسەفە و لۆژیک و خوێندنی باڵایە لە زانکۆی زاخۆ.

لە ساڵی ٢٠٢٠ وانەبێژی ئۆنلاین بووە لە زانکۆی (Al-Madinah International University) لە مالیزیا.

بەشداریی لە پازدە کۆنفرانسی جیهانیی کردووە لە وڵاتانی: میسر، مالیزیا، تورکیا، مەغرب و عێراق.

نزیکەی ٢٠ لێکۆڵینەوەی زانستی و ئەکادیمیی لە گۆڤارە جیهانییە باوەڕپێکراوەکاندا بڵاوکردوونەتەوە.

**چەندین پەڕتووکی بە زمانی عەرەبی و کوردی نووسیون:**

(المحاججة العقلية في برهنة حقائق القرآن الكريم) جاری یەکەم لە وڵاتی میسر چاپ و بڵاوکرایەوە. بۆ جاری دووەم لە دەزگای «نوور پابلش» بڵاوکرایەوە. جاری سێیەمیش لە (مؤسسە السبیل) بڵاوکرایەوە.

(جدلية اعجاز النص القرآني لغويا وفكريا- اعتراضات ومعالجات). جارێک لە وڵاتی لوبنان چاپکراوە و بۆ جاری دووەمیش لە بەغدا چاپکراوە.

(ظاهرة التأثير والتأثر بين التوجيه النحوي والمعنى في ضوء نظرية النظم)، لە وڵاتی میسر چاپکراوە.

(النزعة الشكوكية بين جذورها التاريخية ونتاجها المعاصر) تحت الطبع.

«ئیلحاد - شرۆڤەکرنەکا ئاقلانە و زانستییە ب شێوازێ دان و ستاندنێ» لە ئێران چاپکراوە.

«هەلوەشاندنا گۆمانبازییان ل دۆر قورئان و سوننەتێ»

«تێگەهێ فەلسەفێ - گەشتەکا هزری بۆ بنەما و تیور و سیستەمێن فەلسەفی»

«تیورا مەعریفێ (ئیبستمۆلۆژیا) - گەشتەکا هزری بۆ بنەما و تیور و سیستەمێن مەعریفێ»

«تیـــورا هەبوونا (ئەنتولۆژیا) - گەشتەکا هزری بۆ بنەما و تیور و سیستەمێن هەبوونێ» ل ژێر ئامادەکرنێدایە.

«خوێندنەوەیەکی ڕەخنەیی بۆ سەفسەتە و هەڵە هزرییەکان» ئەم پەڕتووکە وەرگێڕدراوەی بەردەستتانە.

هەروەها پێشەکیی بۆ ١٣پەڕتووک نووسیون.

# ناوەڕۆک




ئەم پەرتووکە هەوڵێکە بۆ هەڵدانەوەی ڕەگ و ڕیشەی سەفسەتە و پیشاندانی کاریگەرییەکەی لەسەر هزری هاوچەرخ و چۆنیەتی بڵاوکردنەوەی بە ناوی ڕۆشنبیری و نوێخوازی بە مەبەستی بەهەڵەدابردنی واقیعی گشتی و سەپاندنی هەندێک ئامانجی ئایدیۆلۆژی تایبەت. هەروەها هەوڵێکە بۆ وشیارکردنەوەی گەنجان بۆئەوەی نەکەونە بەر کاریگەری سەفسەتەی سەردەم و ئەو هەڵە هزرییانەی لەلایەن ڕاگەیاندن و نووسەرە ئاراستەکراوەکانەوە بڵاو دەکرێنەوە.







نرخ : ٣٥٠٠ دینار